چاپی یەکەم

# ڕۆژێک ٣٦٥ جار (٢) دووبارە نەکەینەوە

مەسعود لەعلی

- پاولۆ کۆیلۆ
- جبران خلیل جبران
- باربارا دی ئەنجلس
- وین دایەر
- جان گری
- برایان تریسی
- کریشنا مۆرتی
- نیل دۆنالد والش

و ....

**وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی**




162 posts | 11.8k followers | 5 following

Promote | Edit profile

**پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚**

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

👻Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsI...

Hawraman, Slemani, As Sulaymaniyah, Iraq







    

# ڕۆژێک ٣٦٥ جار دووبارە نەکەینەوە ٢

نوسینی: مەسعود لعلی

وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی

چاپی یەکەم

٢٠١٤

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە(٤٨٨)**


**ناسنامەی کتێب**

- ناوی کتێب: ڕۆژێك ٣٦٥ جار دووبارە نەکەینەوە ٢
- نوسینی: مەسعود لەعلی
- وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی
- بابەت: بەختەوەری، ڕێورەسمی ژیان، سەرکەوتن، وتە.
- بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی: (١١٧٠)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.**

ناونیشان:

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)




# پێڕست

## كانوونی دووه‌م



٢



### پاولۆ كۆیلۆ

**(١٩٤٧)**

نووسه‌ری به‌ناوبانگی به‌رازیلی، له ساڵی ١٩٨٨دا له‌گه‌ڵ بڵاوكردنه‌وه‌ی كتێبی (كیمیاگه‌ر) ناوبانگی جیهانی په‌یدا كرد. به‌رهه‌مه‌كانی ئه‌و له زیاتر له ١٢٠ وڵاتی جیهاندا بڵاو كرانه‌وه و بۆ ٤٦ زمان وه‌رگێردراون.

# (ئەگەر هێشتا زيندوويت بيرت بێ كە....)

سەرگەردان لە شارە. هەرچەندە مەوعيدى ديدارێكى هەيە، درەنگ لە خەو هەڵدەستێت و كاتێك لە هۆتيلێ دەردەچێت، تێدەگات كە پۆليس ئۆتۆمبێلەكەى بردووە و درەنگ دەگاتە مەوعيدەكەى. نانى نيوەڕۆ لەكاتى خۆى زياتر درێژە دەكێشێت و بير لە غەرامەكەى دەكاتەوە. پارەيەكى زۆرە.

لەپڕ بيرى لە پارەيەكى كاغەز كردەوە كە دوێنێ لەسەر جادە دۆزيبوويەوە. پەيوەندييەكى سەير لەنێوان ئەو پارە كاغەزە و ئەو رووداوە دەبينێت كە لەو بەيانييەدا بەسەرى هات. لەبەر خۆيەوە دەڵێت: لەوانەيە ئەم پارەيەم لەسەر رێگاى كەسێك هەڵگرتبێتەوە كە بەراستى پێويستى پێى بووە. پێى وايە دەبێ خۆى لەدەست ئەم پارە كاغەزە رزگار بكات و لەهەمان كاتدا چاوى بە دەرۆزەكەرێك دەكەوێت كە لەسەر رێگاكەدا دانيشتووە.

دەرۆزەكەرەكە دەڵێت: (ساتێك بوەستە، من بەدواى سەدەقەوە نيم، من شاعيرم و دەمەوێ لەبەرانبەر پارەدا، شيعرێكتان بۆ بخوێنمەوە).

سەرگەردان دەڵێت: (باشە، با كورت بێت، من پەلەمە). دەرۆزەكەر دەڵێت: (ئەگەر هێشتا زيندوويت لەبەرئەوەيە كە هێشتا نەگەيشتوويتە ئەو شوێنەى كە دەبێ لێى بيت).

## (هەستیاری)

دوژمــن لەبــەر ئــەو هۆیــە لــە دژمــان دەجــەنگێت کــە دەزانــیٚ هەســتیارین. لــە جەنگەکەدا ئێمە هەمیشە هەوڵدەدەین بەرگری لە خاڵی لاوازمان بکەین.

## (خاوەن سامانی بەهادار)

ئەگەر کەسێك داوای یارمەتیم لـیٚ بکـات بـەو مانایەیـە کـە هێشـتا لەسـەر زەوی بەهایەکم هەیە.

## (مەحال)

تەنیا یەك شت دەتووانێت بەدیهێنانی خەونێك مەحاڵ بکات.

ئەویش ترسە لە شکست

## (پێزانین)

شت گەلێك لە ژیاندا هەن کە نوسینێکیان لەسەرە:

(تۆ قەدری من ناگریت مەگەر ئەوەی کـە لەدەسـتم بـدەیت و دووبـارە بەدەسـتم بێنیتەوە).

## (پەیوەندی لەگەڵ خوا دا)

خودا قسەكانی لە دنیای دەوروبەرمان نوسیووە. تەنیا ئەوەندە بەسە بڕوانیتە ڕووداوەكانی ژیانت و ببینیت كە خودا بەدرێژایی ساتەكانی ڕۆژ، وشە و داواكانی لە كوێ دەنووسێت.

## (ئەقلی عەشق)

ئاقڵەكان تەنیا لەبەرئەوەی عاشقن، ئاقڵن.

## (مۆزی رۆژگار)

پیاوێك بڕیاریدا چەند هەفتەیەك لە نیپاڵ لە پەرستگایەكدا نیشتەجێ ببێت. رۆژێك دوای نیوەڕۆ لە یەكێك لە پەرستگاكاندا راهیبێكی بینی كە دەم بە بزەوە لە میحراب دانیشتبوو.

پرسی: (بۆچی بزەت دێت؟)

راهیبەكە پرسێكەكەی كردەوە. مۆزێكی رزیوی لێ دەرهێنا و وەڵامی دایەوە: (چونكە لە مانای "مۆز" تێدەگەم. ئەوە ژیانە كە ڕەوگەی خۆی كۆتایی پێ هێناوە و سوودی لێوەرنەگیراوە...وئێستاش زۆر درەنگە). پاشان مۆزێكی تری لە پرێسكەكەی دەرهێنا كە هێشتا سەوز بوو. مۆزەكەی پیشاندام و دووبارە خستیەوە ناو پرێسكەكەی و وتی: (ئەوە ژیانە كە هێشتا رەوگەی خۆی نەگرتووەتە بەر و چاوەڕێی ساتی گونجاوە).

سەرەنجام مۆزێكی گەیشتووی لە پرێسكەكەی دەرهێنا، توێكڵەكەی لێ كردەوە، لەگەڵ خەڵكەكەدا دابەشی كرد و وتی: (ئەمە ساتی ئێستایە. بزانە كە دەبێ چۆن تیایدا بژیت).

## (پێناسەی ئازادی)

ئازادی بە مانای نەبوونی پەیمان نایەت. ئازادی بریتییە لە توانای هەڵبژاردن و پەیمان بەرانبەر ئەو هەڵبژاردنە.

## (بەهای ئازادی)

بەهای ئازادی بە قورسایی بەهای کۆیلایەتی گرانە. تاکە جیاوازی ئەوەیە کە بە خۆشی و خەندەوە ئەم بەهایە ئەدەیت ئەگەرچی خەندەیەکی ئاوێتەش بێت بە فرمێسك.

## (وا پێویست بووە)

ئەم تێکستەی ژێرەوە لە سەر دیوارێك لە (بوینس ئایرس)ی پایتەختی ئەرژەنتین نوسراوە:

"ئەگەر کەسێکت خۆش دەوێت، سەربەستی بکە. ئەگەر گەڕایەوە لای تۆ لەبەرئەوەیە کە وا پێویست بووە. ئەگەر نەگەڕایەوە، لەبەرئەوەیە کە وا پێویست بووە."

## (ئازادی یان کۆیلایەتی)

تەنیا (عەشق) کۆیلایەتی دەکاتە ئازادی.

# (دراما)

لە ماڵی نیگارکێشێك لە نیویۆرك میوانێك هەیە. بۆی باسی فریشتەکان و کیمیاگەری دەکەم. پاشان هەوڵ ئەدەم ئەم تیۆرەیەی کیمیاگەری بۆ میوانەکانی تر روون بکەمەوە کە هەموومان تەواوی جیهانمان لە ناوەوەماندا هەیە و لەبەرانبەریدا بەرپرسیارێتیمان لەئەستۆیە.

دەچمە ناو وشەکانەوە، بەڵام ناتووانم باش روونی بکەمەوە. نیگارکێشەکە کە بە هێمنی گوێ دەگرێت داوا لە هەمووان دەکات لە پەنجەرەکەی ستۆدیۆی ئەوەوە سەیری دەرەوە بکەن.

(چی ئەبینیت؟)

یەکێکیان وەڵام ئەداتەوە: (شەقامێك)

نیگارکێشەکە کاغەزێك لەسەر شووشەی پەنجەرەکە دادەنێت و چیتر شەقامەکە نابینم. پاشان بە قەڵەم دایەن، چوارگۆشەیەك لە کاغەزەکە دێنێتە دەرەوە.

(ئێستا لێرەوە بڕوانە، چی ئەبینیت؟)

یەکێك لە میوانەکان دەڵێت: (هەر ئەو شەقامە).

نیگارکێشەکە چەند چوارگۆشەیەکی تر لە کاغەزەکە دێنێتە دەرەوە و دەڵێت:

(هەر کام لەو چوارگۆشانە هەموو شەقامەکە دەگرێتە خۆی. ئێمەش هەموو گەردوونمان لەخۆماندا هەیە).

هەموو ئامادەبووان چەپڵە بۆ ئەم وێنەی جوانەی چەمکێکی ئاڵۆز لێدەدەن.

## (دوو کێشە)

مرۆڤ دوو کێشەی گەورەی هەیە
یەکەم ئەمەی کە دەبێ لە کوێوە دەست پێبکات
و دووەم ئەمەی کە دەبێ لە کوێ بوەستێت.

## (ئەژدیها و مێروولە)

ئێمە هەموومان خۆمان بۆ کوشتنی ئەژدیها ئامادە دەکەین
بەڵام لە کۆتاییدا لەلایەن ئەو مێرولە بچوکانەوە هەڵدەدرێنرێین کە هیچ بایەخمان پێ نەدەدان.

## (ڕێگای ڕاست)

ئەوەی کە بزانیت لە ڕێگایەکی ڕاستدایت شتێکە
بەڵام ئەوەی کە پێت وابێت ڕێگای ڕاست تەنیا ئەمەیە، شتێکی ترە.
هەرگیز ناتوانین دەربارەی ژیانی ئەوانیتر حوکم بدەین. چونکە هەموو کەسێك ئازار و رووکەشی خۆی هەیە.

## (پەرچەکردار بەرانبەر هەڕەشە)

دوو جۆر گەمژە هەن:

ئەوانەی کە بەهۆی ئەنجامدانی کارێك دەست لە ئەنجامدانی کارێك دەکێشنەوە

ئەوانەش کە گومانیان هەیە لەوەی بتوانن دەست بدەنە کارێك چونکە پڕمەترسییە.

## (ڕاستییەك بارەی ڕاستییەوە)

ئەگەر بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێیت، بزانە ڕاستی هەمیشە لەگەڵ ئەوەدا کە چاوەڕێیت، كۆك نییە.

## (کێ کارەکەی کرد؟)

هەر گەڕانێك بە بەختی تازەکارەکان دەست پێدەکات و بە تاقیکردنەوەی پایەداریی سەرکەوتووەکان کۆتایی دێت.

## (خاوەنی ئیمان)

داننان بە ئیمانی مرۆڤێك لە کردارەکانیدایە نەك قسەکانی.

## (دەرگایەك بەناوی دڵ)

خودا هەرگیز لە دەرگای سەرەوە ناچێتە ناو مرۆڤەوە، بەڵكو ئەو دەرگایەی كە بەكاری دەهێنێت دڵی مرۆڤە.

## (خاكیبوون)

شەیتانێك بە شەیتانێكی تری وت:

سەیری ئەو پیاوە پیرۆزە بكە كە بە رێگادا دەڕوات.

نیازمە بچمە لای و رۆحی بگرم. هاورێكەی وتی: گوێ لە قسەی تۆ ناگرێت، تەنیا بیر لە شتە پیرۆزەكان دەكاتەوە.

بەڵام شەیتان هەر بە شێوازە تامەزرۆ و دەمارگیرییە هەمیشەییەكەی خۆی گۆڕی بۆ شێوەی (جوبرەئیل)ی فریشتە و لەبەردەم پیاوەكەدا قوت بووەوە، وتی: (ئامادەم یارمەتیت بدەم).

پیاوە پیرۆزەكە وتی: (دەبێ منت لەگەڵ كەسێكی تردا لێ تێكچووبێت، من لە ژیانمدا كارێكم نەكردووە كە ببمە مایەی بایەخپێدانی فریشتەیەك). و لە رۆیشتنەكەی بەردەوام بوو بێ ئەوەی بزانێ لە چی رایكردووە.

## (قۆناغی پیری)

قۆناغی پیریمان پەیوەندی بە شێوازی ژیانمانەوە هەیە.

## (عەشق دەتكاتە ئیمپراتۆر)

عاشقی، ئەزموونێكی شاهانەیە، چونكە وەكو ئیمپراتۆرێك رەفتار دەكەیت.

## (یاخیبوون لە دەسەڵات)

لوییز كارلوس پرستس- گرنگترین رابەری كۆمەنیستی بەرازیل- پاش ساڵانێك دوورەوڵاتی لە مۆسكۆ، خۆی بۆ گەڕانەوە بۆ بەرازیل ئامادە كرد. كوڕەكەی بڕیاریدا وێنەی گەڕانەوەی باوكی گرت. پرستس نەیهێشت ئەم كارە بكات.

بەڵام كوڕەكەی كە دەیزانی لەبەرانبەر رووداوێكی مێژوویی گرنگدایە، ئامێرەكانی برد و دەستیكرد بە تۆماركردنی هەموو شتێك. لە یەك ساتدا، پرستس بۆی دەركەوت چ باسە. هاوڕێكانی جێهێشت و گەیشتە سەر كوڕەكەی.

كوڕەكە بۆی گێڕامەوە: پێم وابوو ناخۆشترین ساتی ژیانم هاتووە. بەڵام باوكم خۆی گەیاندە من، چاوی بڕییە چاوەكانم و وتی: (ئافەرین. تۆ رێك ئەو كارەت كرد كە من قەدەغەم كرد و ئەمەش نیشانەی بەهای تۆیە. هیوادارم لەبەرانبەر ئەوانیتریشدا خۆگریی خۆت بپارێزیت).

## (داوا و كردار)

ژیان نەك لە داواكان بەڵكو لە كردارەكان دروست دەكرێت.

شوبات





## جوبران خەلیل جوبران

(١٨٨٣-١٩٣١)

ئەدیب، نوسەر، شاعیر و نیگارکێشی ناوداری لوبنانی

## (بۆی باسی ئازادی بکە)

دەڵێن: (ئەگەر بینیت کۆیلەیەک خەوتووە هەڵیمەسێنە. لەوانەیە خەو بە ئازادییەوە ببینێت). بەڵام من دەڵێم: (ئەگەر بینیت کۆیلەیەک خەوتووە هەڵیسێنە و بۆی باسی ئازادی بکە!)

## (جۆری روانین)

توانای ژین پەیوەندی هەیە بە چۆنێتی روانینی ئێمە لە ژیان!

## (پاک بەڵام بێهودە)

پەرە کاغەزێک کە وەکو بەفر سپی بوو وتی: (من پاک و سپی و خاوێن دروستکراوم و تاهەتایە هەروا دەمێنمەوە. من وام پێباشترە کە بسوتێم و ببمە خۆڵەمێشێکی سپی، نەک ئەوەی کە رێگە بە رەشایی بدەم لێم نزیک بێتەوە و پڕم بکات لە پەڵە و تاریکی).

شوشە مەرەکەب گوێی لە قسەکانی کاغەزی سپی بوو و لە دڵی رەشی خۆیدا پێی پێکەنی، بەڵام ئازایەتی ئەوەی نەبوو کە لێی نزیک بکەوێتەوە. قەڵەم رەنگەکانیش کە گوێیان لە قسەکانی کاغەز ببوو، هەرگیز لێی نزیک نەبوونەوە و

بەمشێوەیە کاغەزی سپی هەر بەو شێوەیەی کە دەیویست وەکو بەفر بە سپێتی و پاکیزەیی مایەوە. بەڵام پوچ و بێهودە و بێ کەڵك!

## (باڵی فڕین)

ئەو کەسانەی کە عەشق باڵی پێ نەبەخشیون ناتوانن بۆ ئەودیوی هەورەکان بفڕن و دنیای جادوویی ئەودیو ببینن.

## (دوو شەریك)

(دەسەڵات) و (ئۆقرەگرتن) هەمیشە شەریکی یەکترن!

## (وەرزەکانی ساڵ)

وەرزەکانی ساڵ چەندن؟

جگە لە بیرۆکە گۆڕاوەکانی خودی تۆ (بەهار) بێدارییە لە سینەی تۆدا و (هاوین) نییە مەگەر رواڵەتی لەباردابوونی خۆت کە بۆئەو شتەی کە لە منالیت تیاتدا ماوەتەوە لای لایە دەکەیت؟ و لە تۆ دەپرسم:

(زستان) چییە؟ جگە لە خەوێکی پڕ لە خەونەکانی هەموو وەرزەکانی تر!

## (كەمتەرخەمی)

دەستی سستی نیازتان هەمیشە لە گەیشتن بە ئامانج كورتە !

## (رەخنەگرتن لە قەناعەت)

ئەگەر سروشت گوێبیستی ئامۆژگارییەكانی ئێمە بووایە لەبارەی (قەناعەت)ەوە و بیخستنایەتە كار، ئیتر رووبارێك نەدەڕژایە ناو دەریا و زستان شوێنی خۆی نەدایە بەهار!

## (واتای راستەقینەی دەست كراوەیی)

ئەمەی تۆ شتێكم بدەیتێ كە من لە تۆ زیاتر پێویستم پێیەتی دەست كراوەیی نییە ! بەڵكو دەست كراوەیی ئەوەیە، شتێكم بدەیتێ كە خۆت زیاتر لە من پێویستت پێی بێت !

## (جێگەی داخ )

ئەمەی كە من دەستی بەتاڵم بەرەو رووی ئەوانیتر درێژ بكەم و كەسێك شتێكی نەخاتە ناو نەگبەتییە ! بەڵام ئەوە جێگەی داخە كە من دەستم بە پڕی بەرەو ئەوانیتر درێژ بكەم بەڵام كەس هیچی لێ هەڵنەگرێت.

## (ژیان بەرەو دواوە ناگەڕێتەوە)

تۆ دەتووانیت کۆشش بکەیت وەکو منداڵەکانت بیت، بەڵام نەتەوێ کە ئەوان وەکو خۆت لێبکەیت، چونکە ژیان بەرەو دواوە ناگەڕێتەوە و لە دوێنێدا ناوەستێ.

## (مەودا)

زۆرێك لە دینەکان وەکو شوشەی پەنجەرەن، لەودیویانەوە راستی دەبینین بەڵام لە هەمان کاتدا، لە راستی جیامان دەکەنەوە.

## (بەهای مرۆڤ)

بەهای مرۆڤ لەو شتەدا نییە کە بەدەستی دێنێت، بەڵکو لەو شتەدایە کە تامەزرۆی بەدەستهێنانیەتی!

## (هیوا )

لە دڵی هەر زستانێکدا، سەرەتای بەهارێك و لە پشت دەمامکی هەر شەوێك، سپێدەیەکی سپی هەیە.

## (بكوژی رۆح)

بكوژی جەستە دادگایی دەكەن، بەڵام كەس بكوژی رۆح ناناسێت !

## (فڕین)

هۆشیاری، ژینە بە باڵەوە !

## (تاوات)

خۆزگە چڵە گەنمێكی رواو بوومایە لە سەر خاكی سەرزەمینەكەم تاوەكو ساوایەكی برسی بمچنێت و دەنكەكانم دەستی مەرگی لێ دوور بخاتەوە.

خۆزگە میوەی پێگەیشتوو بووم لە باخەكانی وڵاتی خۆم تاوەكو ژنێك برسێتییەكەی بە من تێر بكات.

خۆزگە باڵندەیەك بووم بە ئاسمانی نیشتمانی خۆمدا و پیاوێكی ماندوو راوی دەكردم و بە جەستەی مردووم سێبەری گۆڕی لە جەستەی دوور دەخستەوە !

## (شەرەفمەندی)

کەسێك کە نیازیەتی ئەو بۆ ئەنجامدانی کارێکی شەرەفمەندانە پاڵ بنێن، هیچ کاتێك شەرەفمەندی ئەنجامدانی ئەو کارە بەدەست ناهێنێت!

## (پرسیارەکەتان بگۆڕن)

مەڵێن نیشتمانەکەتان ئەتوانیٚ چیتان بۆ بکات. ئێوە دەتووانن چی بۆ بکەن؟

## (پێ لە ناو پێڵاوی ئەوانیتردا)

فەیلەسوفێك بە پێڵاوی دڕاو و کۆنەوە چووە دوکانێکی پینەچی. فەیلەسوفەکە بە کابرای پینەچی وت: (تکایە پێڵاوەکانم بۆ چاك بکەرەوە) و کابرای پینەچی وتی: (منیش ئێستا سەرقاڵی پێڵاوەکانی پیاوێکی ترم. پێش ئەوەی بشتووانم پێڵاوەکانی تۆ چاك بکەمەوە کۆمەڵێك پێڵاوی ترم لەبەردەستە بۆ چاککردنەوە. بەڵام هەرچۆنێك بێت پێڵاوەکانت دانیٚ و ئەمڕۆ ئەم جوت پێڵاوە بکەرە پێت و سبەی وەرە سۆراخی پێڵاوەکانی خۆت).

فەیلەسوفەکە شپرزە بوو و بە تووڕەییەوە وتی: (من جگە لەوانەی خۆم پێڵاوی هیچ کەسێکی تر ناکەمە پێم).

پینەچی وتی: (كەواتە بەم پێیە تۆ بە راستی فەیلەسوفیت و لەمرووەوەیە كە ناتووانیت پێیەكانت بخەیتە ناو پێڵاوەكانی كەسێكی تر! هەر لەم شەقامە پینەچییەكی تر هەیە كە باشتر لە من لە حاڵی فەیلەسوفەكان تێدەگات. بۆ چاككردنەوەی پێڵاوەكانت بڕۆرە لای ئەو).

## (بەرەوپێشچوونی جیهان)

ئەگەر من و تۆ كارێك نەكەین

(دوو) بێ نرخی وابەستەی یەكتری دەبین و چیمان دەبێ؟

رۆحێكی بەتاڵ!

ئەگەر هەمووان پێیان وابێت كە نوێنەری هیچ مەزنایەتییەك نین

هەرگیز جیهان بەرەو پێش ناچێت!

## (هەڵە)

خراپترین هەڵە كە دەیكەین

سەرنجدانە لە هەڵەی ئەوانیتر!

## (گوڵ و بوڕکان)

کاتێك دڵت شاخی بوڕکانە
چۆن چاوەڕوان دەکەیت
لەناو دەستەکانتدا گوڵ بڕوێت؟

## (بە ئیمانەوە کشتوکاڵ بکە)

هەر کوێیەکی زەوی کە حەز دەکەیت هەڵیکەنە
گەنجینەیەك ئەدۆزیتەوە
بەو مەرجەی کە بە ئیمانەوە زەوی هەڵکەنیت.

## (تێپەڕین لە شەو)

مرۆڤ ناگاتە سپێدە مەگەر لە ڕێگەی شەوەوە.

## (لەناو ناختدا پەیامبەرێك هەیە)

خوداوەند لە هەر (گیان)ێکدا پەیامبەرێکی داناوە
تاوەکو بەرەو ڕووناکایی شارێك ڕێنوێنی بکات

لەگەڵ ئەوەشدا

زۆر کەس، ژیان بێ ئاگا لەوەی کە (ناخ)ێك هەیە

لە دەرەوە سۆراخ دەکەن!

## (خەیاڵبینی و واقیعبینی)

هەموومان لەبارەی ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە خۆمانەوە

واقیعبینین

بەڵام لەبارەی ئەو شتەی کە پەیوەندی بەوانیترەوە هەیە

خەیاڵبینین!

## (فریشتەی بیرۆکە)

چوزانیت

کە فریشتەکان هەر بیرۆکەی پەرت و بڵاوی ناو بۆشایی ئاسمان نین؟

## (خۆناسین)

کە گەیشتیتە دڵی ژیان ئەوا بۆت دەرئەکەوێت

لە گوناهکاران بەرزتر

و لە پەیامبەران لەخوارتر نیت!

تـــازار





## وین دایەر (١٩٤٠)

دکتـــۆر ویـــن دایـــەر، دەروونناس و بیرمەنـدی ئـەمریکی لـە چـەقی هـەژاری و ئاوارەییەوە دەرکەوت. قۆناغی ساوایی بەهۆی پەرتەوازەیی خێزانەکەی لـە خانـەی بەخێوکردن بەسەر برد. بـەڵام بـە هـۆی تێگەیشـتن و تێـڕوانینی نایـاب، روویکـردە دنیای دەروون و پەی بە توانا ناوەکییەکانی مرۆڤ برد.

ئەو لە ساڵی ١٩٨٧دا وەکو باشترین وتاربێژی ئەمریکا ناسرا.

## (ژیان لە پێشكەدا)

ئەگەر منالآن بە جۆرێك دروست بوونایە كە لە ترسی شكست، دەستبردن بۆ كارە تازەكان بترسانایە، هەرگیز لە بێشكەی خۆیان نەدەهاتنە دەر.

(چۆن چۆنی منالّی بڕوابەخۆبوومان هەبێت)

تۆ ناتووانیت بڕوابەخۆبوون بەشێوەیەكی پێچراوەی ناو پاكەت بدەیتە دەست منالّەكانت. ئەوان دەبێ ببینن كە ئێوە ژیانی خۆتان بە بڕوابەخۆبوون بەسەر دەبەن تاوەكو بەهەمان شێوە پەروەردە ببن.

## (بایەخدان بە سەربەخۆیی)

لەو خێزانانەدا كە گرنگی بە سەربەخۆیی كەسایەتی ئەدەن، هەر هەنگاوێك بەرەو هەبوونی كەسایەتی سەربەخۆ، بە پرسێكی سروشتی و ئاسایی هەژمار دەكرێت.

## (كردار و نیاز)

كردارە بچوكەكان لە نیازە گەورەكان بەنرخترن.

## (دایك وباوكی جیاواز)

له سه‌رانسه‌ری دنیای ئاژه‌لاندا، باوك و دایكبوون به‌و مانایه‌یه كه شاره‌زایه‌تی و هونه‌ری پیچوییست بۆ سه‌ربه‌خۆبوون فێر ببن. ئینجا دوای ئه‌وه جێیان بهێڵن. له‌ناو ئێمه‌ی مرۆڤه‌كانیشدا غه‌ریزه‌كان هه‌ر به‌و شێوه‌یه‌ن. به‌لام پێده‌چێ نیازی ده‌مارگیرانه بۆ خاوه‌ندارێتی زاڵ بێت و ئامانج له په‌روه‌رده‌كردنی منداڵ به‌شێوه‌ی گیانله‌به‌رێكی سه‌ربه‌ست و سه‌ربه‌خۆ به‌ره‌و په‌روه‌رده‌كردنی منداڵ بۆ وابه‌سته‌كردنی ، لایداوه.

## (هۆشمه‌ندترین)

ئه‌و كه‌سانه‌ی كه كێشه‌كان وه‌كو مه‌رجی سروشتیی ژیان قبوڵ ده‌كه‌ن و نه‌بوونی كێشه به مه‌رجی به‌دیهێنانی شادی نازانن، هۆشمه‌ندترین و له‌هه‌مان كاتدا ده‌گمه‌نترین كه‌سانن.

## (میهره‌بانی هه‌ڵبژێرن)

گه‌وره‌ترین ته‌كنیكی هێنانی ئارامی بۆ ناو ژیان ئه‌وه‌یه كه له‌نێوان (له‌سه‌رحه‌قبوون) و (میهره‌بانبوون)دا میهره‌بانبوون هه‌ڵبژێریت.

## (دەست لەكاركێشانەوە)

بۆئەوەی ئەقڵتان ئارام بێت، وەكو بەڕێوەبەری گشتیی دنیا دەست لەكار بكێشنەوە.

## (ئەقڵی ئێمە)

ئەقڵە گەورەكان لەبارەی ئایدیا گەورەكان
ئەقڵە ئاساییەكان لەبارەی رووداوە ئاساییەكان و
ئەقڵە بچوكەكان لەبارەی خەڵك ئەدوێن.

## (هەنگاوێك بەرەو پێشەوە)

بەركەوتنی شەقێك لە پشتەوە
یەكسانە بە هەنگاوێك بەرەو پێشەوە.

## (رێسای شكست)

من بە تەواوی بڕوام وایە كە بۆ شكستخواردن رێسایەك هەیە:
هەوڵدان بۆ رازیكردنی هەمووان و پشتگوێخستنی ترپەكانی ناوەوەی خۆمان.

## (زەمینەی سەرکەوتن)

تۆ تا رادەیەك لە كۆمەڵدا سەركەوتوو دەبیت ئەگەر خۆت هەڵیبژێریت.

## (بەرهەمدار)

پێوەری راستەقینەی هۆش

ژیـانێکی بەرهەمـدارە کـە هـەموو رۆژێـك و هـەموو سـاتێك لەگـەڵ هەسـتی بەختەوەریدا جمك بێت.

## (تەنیا رەخنە لە مردووەكان ناگیردریت)

هەر جارێك كە دەگەمە گۆڕێك، وای بۆ دەچم كە لە بەردەكەی نووسرابێت: (گەر دەتەوێ بە خراپ باست نەکەن وا خۆت دەربخە کە مردوویت).

## (دوو هەستی بێ بەر)

بەدرێژایی ژیان دوو هەست لە هەموو هەستەكانی تـر بـێ بەرهـەمترە. یەكێكیان هەستکردن بە کەموکوڕی لەبارەی ئەو شتەی کـە روویـداوە و دووەمیـان نیگـەرانی لەبارەی ئەو شتەی کە لەوانەیە لە ئایندەدا رووبدات.

## (سادەژیانی دەروونی)

سادەیی ژینی دەرەوە ئەوەندە گرنگ نییە، گرنگ سادە ژیانە لەناوەوە.

## (هاودژی)

(حوكمدان) و (ئارامی) دژی یەكترین.

## (بەندیخانەی ترس)

ترس بەندیخانەی ئێمەیە.

## (شانس)

تا ئەو كاتەی كە شانسێك تاقی نەكەیتەوە، شانست نابێت.

## (كۆسپێك بەناوی بەلام)

سەركەوتن واتە لابردنی كۆسپی (بەلامەكان) لەسەر رێگاتان.

## (مەعنەویەت)

بە بۆچوونی من مەعنەویەت

دەمارگیری یان یاسایەکی تایبەت نییە

ڕووناکی و سرود و تەرکیزە لەسەر ئەزموونی عەشق

و خۆشبەختیی ئەو ناخەیە کە ئەو سیفەتە دەروونییانە ڕەنگدەداتەوە

## (ڕووناکی تاهەتایی)

تۆ، ناو، پیشە، جەستە و بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکانی خۆت نیت. تۆ بەبێ بایەخدان بە ڕابردوو و ئێستا، ڕووناکییەکی تاهەتایی و خوداییت و لەبەر هۆکارێك لە هۆکارەکان لێرەیت.

## (پێشبینی)

ئەگەر دەتەوێ بزانیت لە ڕابردوودا چیت کردووە

بڕوانە حاڵی خۆت

ئەگەر دەشتەوێ بزانیت لە ئایندەدا چی ئەکەیت

بڕوانە حاڵی خۆت کە خەریکی چیت

## (بانگەشە)

ئەگەر لەو پۆلە مرۆڤانەیت کە ئێستا بەشێوەیەك دەژین و بەخۆیان دەڵێن لە ئایندەدا بەشێوازێکی تر دەژین، بزانە ئەم بانگەشانە هەموویان بەتاڵن. تۆ مرۆڤێکیت کە هەمیشە کارەکان هەڵدەپەسێریت و هیچ کاتێك کارێك ئەنجام نادەیت.

## (تێڕوانین)

هەوڵ بدە لە رووبەڕووبوونەوەت لەگەڵ هەموو کەسێکدا بە چاوی مامۆستایەکەوە لێی بڕوانیت و شتێکی لێوە فێر بیت.

## (رەگی کێشەکان)

ئەو (من وەهام)انەی کە کەسایەتی تۆ وردوخاش دەکەن، لە چوار رستەی دەمارگیریی خوارەوە سەرچاوە دەگرن:

١-(من وەهام)

٢-(هەمیشە وا بووم)

٣-(بەدەست خۆم نییە)

٤-(سروشتم بەم شێوەیە بووە)

## (سروشتی مرۆڤ)

شتێك نییە بەناوی سروشتی مرۆڤ. بەم دەربڕینە بۆئەوە داهێنراوە تا خەڵك پۆلێنبەندی بکەن و ببێتە هۆکاری بیانوو و پۆزشەکان. کەسایەتی هەر کەسێك بەرەنجامی هەڵبژاردنەکان و بڕیارەکانی خودی ئەوە.

## (کوتانی ئاسنی سارد)

بارودۆخی دنیا و ژیان بە جۆرێکە کە کارەکانی تۆ و توڕەبوون یان نەبوونی تۆ، هەر ئەو کاریگەرییەی لەسەر جیهانی دەوروبەرت هەیە کە رشتنی پەرداخێك ئاو بەسەر تاڤگەی (نیاگارا)دا هەیەتی.

## (تۆڵە لە خۆ)

توڕەبوون، تۆڵەکردنەوەی هەڵەی ئەوانیترە لە خودی خۆت.

## (درێژی یان پانی)

تەمەندرێژی تەقریبەن ئاواتی هەموومانە

بەڵام ژیان بە باشی، خەونی خەڵکێکی کەمە.

## (زوو هەنگاو هەڵێنە)

کێشەکان، رێژەی سەدیی مردنیان لە قۆناغی منالێدا بەرزە.

نیسان





پسپۆڕی پەیوەندییەکان و گەشەی تاکەکەسی و خاوەنی پڕفرۆشترین کتێبەکانە لەم بوارەدا.

## باربارا دی ئەنجلس



کتێبی (پیاوان خەڵکی مەریخن و ژنان خەڵکی ڤینۆسن)ی ئەو، یەکێکە لە بەرهەمە هەرە دیارەکان لە بواری پەیوەندییەکانی هاوسەرێتی و چارەسەری خێزانی.

## جۆن گرەی (١٩٥١)

## (بەكەڵك یان بێكەڵك؟)

بودابییەكان چیرۆكێكی كۆنیان لەبارەی پیاوێكەوە هەیە كە ساڵانێكی زۆر بە مەبەستی زیارەت و چوونە ناو سروتی تایبەت، لە سەفەردا بوو بۆ شوێنە پیرۆزەكان.

رۆژێكیان لە كەناراوی رووباردا پیاسەی دەكرد. كاتێك روانییە لایەكەی تری رووبار، بۆی دەركەوت كە كەناری ئەو لایە نەرم و لمینە و هەنگاو هەڵێنان تیایدا ئاسانتر دیارە. لە دڵی خۆیدا وتی: (دەبێ بچمە ئەوبەری رووبارەكە). سروشتی ئەوەی بۆ هات كە لە لقی درەختەكان بەلەمێك دروست بكات و هەر ئەو كارەشی ئەنجامدا. پاشان بەلەمەكەی خستە ناو ئاوەوە و بە سەلامەتی گەیشتە لایەكەی تری رووبارەكە.

هەر كە بەلەمەكەی لە ئاو دەركێشا، وای بە بیردا هات كە: (بە راستی ئەم بەلەمە بەكەڵكم هات. هەوڵێكی زۆرمدا تا دروستمكرد. ناتووانم لێرە جێی بهێڵم، لەگەڵ خۆمدا دەیبەم).

ئەو پیاوە بەلەمەكەی كردە كۆڵی و بۆ هەر شوێنێك دەچوو لەگەڵ خۆیدا دەیبرد و لە هەركوێیەك كە ماندوو ئەبوو، دایدەنا. وایلێهات كە سەفەرەكەی لە كەناری لاكەی تری رووبار بەرەبەرە لە رابردوو سەختتر دەبوو.

كاتێك دێت كە تەنانەت ئەو شتە بەكەڵكەی كە سوودێكی زۆری پێگەیاندووین و چیتر پێویستمان پێ نییە، دەبێتە دەردەسەر بۆمان. دەبێ ئەو شتەی كە پێویستمان پێ نییە وازی لێ بێنین چونكە لەناومان دەبات. **(باربارا دی ئەنجلس)**

## (قوربانی)

بۆ گەیشتن بە ئاواتێك، پێویستە دەیان ئاواتی تر لەناو بەیت.

(باربارا دی ئەنجلس)

## (سەرچاوەی شادی)

کاتێك کە تەنێك لەبری عەشق و خۆشەویستی بە دیاری ئەدەیتە منالەکەی خۆت، فێری دەکەیت کە ئەوە تەنەکانن کە دەبنە هۆی خۆشی و شادییان، نەك عەشق و خۆشەویستی.

(باربارا دی ئەنجلس)

## (بەندیخانە)

گەر مۆڵەت بە ترس بدەیت بەسەر ژیانتدا زاڵ بێت وەکو ئەوە وایە لە بەندیخانەدا بژیت.

(باربارا دی ئەنجلس)

## (چاوەڕوانی تاهەتایی)

ئەگەر بتەوێ چاوەڕێ بیت تا ترسەکانت لەناو بچن، تا بتوانیت دەستبدەیتە کارێك، ئەوا لەوانەیە ناچار بیت تاهەتایە چاوەڕێ بیت.

## (هاوڕێكانت مامۆستای تۆن)

پەیوەندییە گەرم و گوڕەكان، پۆلی نموونەیی خوێندنن كە دەتوووانن گرنگترین وانەی ژیانیان تیادا فێر بیت. لەم نێوەندەدا ئازیزەكانت باشترین مامۆستای تۆن، چونكە تەنیا ئەوانەی كە خۆشت دەوێن دەتووانن بەشێوەیەك كە هیچ كەسێك نایتووانێت كاریگەریت لەسەر دابنێن. ئەوانن كە دەتووانن تۆ زیاتر لە هەر كەسێكی تر بخەنە ژێر وردبین و خاڵەكانی لاوازی و كێماسییەكان و هەستیارییەكانتان ڕووبەڕووتان بكەنەوە.

**(باربارا دی ئەنجلس)**

## (لە خۆتان بپرسن)

كاتێك كەسێك نارەحەتم دەكات یان تەحەددام دەكات یان توانجم تێدەگرێت، لەخۆم دەپرسم:

ئەم كەسە بۆئەوە نێردراوە كە وانەیەكی مەزنم فێر بكات، لەم ساتەدا لە كام تایبەتمەندییە كەسی و دەروونییەم كەمە كە بووەتەهۆی ئەوەی بەرگەی ئازار و ناخۆشی بگرم.

**(باربارا دی ئەنجلس)**

## (رووداوی باش، باش نییە)

ئەگەر رووداوگەلی زۆر باشت بەسەر بێت ئەوا ناتووانیت ببیتە تاکەکەسێکی ئازا.

**(باربارا دی ئەنجلس)**

## (فێربوون)

ئەگەر لە ژیاندا رووبەڕووی کێشە و کۆسپ نەبووایینەوە ئەوا هەرگیز فێری توانا نەدەبووین.

ئەگەر رووبەڕووی تەحەدییەکان نەبووایینەوە ئەوا هەرگیز فێری نەرمی نەدەبووین.

ئەگەر هیچ شتێك دوانەکەوتایە ئەوا هەرگیز فێری ئارامی و ئۆقرە نەدەبووین.

ئەگەر رووبەڕووی ناخۆشی نەبووایینەوە، ئەوا هەرگیز فێری خۆگری و جێگیری نەدەبووین.

ئەگەر رووبەڕووی نائومێدی و دەستەوستانی نەبووایینەوە ئەوا هەرگیز فێری ئیمان نەدەبووین.

ئەگەر ئازارمان نەچەشتایە،

ئەوا فێری عەشق و خۆشەویستی و سۆز نەدەبووین.

**(باربارا دی ئەنجلس)**

## (چاره‌نووسی خۆتان به‌ بیروباوه‌ڕه‌كانتان دیاری بكه‌ن)

جارێكیـان مامۆسـتا رۆحیه‌كـه‌م پرسـیاری لـه‌ كۆمه‌ڵه‌كه‌سـێك كـرد كـه‌ وتـاری پێشكه‌ش ده‌كردن: (ئه‌تانه‌وێ ئاینده‌ی خۆتان بزانن؟)

هـه‌موویان به‌سـه‌ر كورسـییه‌كانیاندا چـه‌مانه‌وه‌. وه‌ك بڵێـی چـاوه‌ڕوان بـوون تـا هێزێكی رازئامێز چاره‌نووسه‌كه‌یان بۆ بخه‌مڵێنێت. به‌ڵام ئه‌و بزه‌یه‌كی كـرد و وتـی: (ئه‌گه‌ر ده‌تانه‌وێ ئاینده‌ی خۆتان بـزانن ئه‌وه‌نـده‌ به‌سـه‌ر كه‌ بڕواننـه‌ بیروبـاوه‌ڕ و ئه‌قڵیه‌تی خۆتان).

**(باربارا دی ئه‌نجلس)**

## (دیاری)

تازه‌ كارتێكم پێگه‌یشتووه‌ كه‌ ئه‌م په‌یامه‌ی له‌سه‌ر نوسراوه‌:

(دوێنێ) به‌شێكه‌ له‌ مێژوو

(سبه‌ی) له‌ ره‌مز و رازێك زیاتر نییه‌

(ئه‌مڕۆ)ش دیارییه‌.

**(باربارا دی ئه‌نجلس)**

## (بێدەنگی نیشانەی رازیبوونە)

رۆژێك لە رۆژان لە ئیمپراتۆریەتی روسیای پێشوودا، کوڕێکی جولەکەی بچکۆلە لە شارێکی بچوك دەژیا. لەو سەردەمەدا سەربازانی قەیسەر لە جولەکە دێهاتییەکانیان ئەدا و قسەیان پێ دەوتن.

کوڕەکە کە باپیرەی، رۆحانی پیری گوند بوو زۆر خۆش دەویست. هەموو رۆژێك کوڕەکە لە کۆڵێتەکەی خۆیەوە دەچووە گۆڕەپانی گوندەکە. سەربازەکان بە پڕتاو دەهاتن و ئەفسەری راسپێردراو، فەرمانی رۆژانەی دەخوێندەوە: (لەمڕۆ بەدواوە هیچ جولەکەیەك نابێ زیاتر لە پێنج پەتاتە بکڕێت یان قەیسەر فەرمانی داوە هەموو جولەکە موڵك وماڵیان بە شارەوانی بفرۆشن).

وهەموو رۆژێکیش رووداوە هەمیشەییەکە دووبارە دەبووەوە. ئەو رۆحانییە پیرە گۆچانەکەی بەرز دەکردەوە و بە دەنگی بەرز هاواری کرد: (رازی نیم!)

پاشان یەکێك لە سەربازەکان رایدەکردە ناو کۆمەڵ و بە قامچی ئەسپەکە لە پیرەمێردە رۆحانیەکە ئەدا و هاواری دەکرد: (بێدەنگ بە پیرەمێردی گەمژە!) و پاشان سەربازەکان لەوێ رۆیشتن.

ئەو رۆحانییە دەکەوتە سەر زەوی، شوێنکەوتەکانی دەچوونە هانای بۆ یارمەتیدانی و تۆز و خۆڵیان لە جلەکانی پاك دەکردەوە و نەوەکەی دەیبردە ماڵەوە. چەندین رۆژ و مانگ کوڕە گەنجەکە بینەری ئەو دیمەنە بوو. دواجار، چیتر نەیتووانی بێدەنگ بێت و رۆژێکیان لەکاتێکدا کە یاوەریی باپیرەی برینداری دەکرد پێی وت: بۆچی هەموو رۆژێك سەرپێچی فەرمانی قەیسەر دەکەیت، تۆ خۆت دەزانی سەربازەکان لێت ئەدەن؟ بۆچی بێدەنگ نابیت؟)

پیاوە رۆحانییەكە میهرەبانانە بزەی بەرانبەر نەوەكەی كرد و وتی: (چونكە كاتێك لەبارەی شتێكەوە كە دەزانم راست نییە نارازی نەبم، وەكو ئەوە وایە بە راست لەقەڵەمی بدەم...)

**(باربارا دی ئەنجلس)**

## (پرەنسیپێكی ئیلهامبەخش)

هیچ شتێك بۆ زانین بچوك نییە و هیچ شتێك بۆ ئەنجامدان گەورە نییە.

**(باربارا دی ئەنجلس)**

## (منالآن ناتووانن...)

منالآن ناتووانن ئارامی و ئۆقره لە خۆیاندا بهێننەکایەوه مەگەر ئەوەی کە هەرچییەك کە دەیانەوێ دەستبەجێ بۆیان فەراهەم ببێت.

منالآن ناتووانن داهێنەرێتی بکەن مەگەر ئەوەی کە بەرپرسیارێتی هەندێ کاروباریان پێ بسپێردرێت.

منالآن ناتووانن بوێری و گەشبینی فێر بن مەگەر ئەوەی کە رووبەڕووی کێشە و کەموکورییەکان ببنەوە.

منالآن ناتووانن خۆگری و پایەداری لە خۆیاندابهێننە کایەوه مەگەر ئەوەی کە کۆششی سەخت بکەن بۆ بەدەستهێنانی شتێك.

منالآن ناتووانن خۆیان چاك بکەن مەگەر ئەوەی کە شکست و سەختییەکان ئەزموون بکەن.

منلآن ناتووانن عزەت نەفسیان هەبێت و مایەی شانازی بن مەگەر ئەوەی کە هەوڵ بدەن بۆ گەیشتن بە ئامانج بەسەر کۆسپەکاندا زاڵ بن.

منالآن ناتووانن رێگا لە خەرەندەکان جیا بکەنەوه مەگەر ئەوەی کە دەرفەتی سەرپێچی و بەرەنگارییان پێبدرێت.

منالآن ناتووانن هەستی هاوکاری و بەشداری لە خۆیاندا بهێننە کایەوه مەگەر ئەوەی کە بزانن هەموو شتێك و هەموو کەسێك پەیوەندیدارن بە یەکترییەوە.

(جۆن گرەی)

## (هەر کەسێک سەربانەکەی گەورەتر بێت بەفری زیاتر دەبێت)

تەقریبەن هەر چیرۆکێکی سەرکەوتنی گەورە پڕە لە نموونەکانی دەرکردن، شکستهێنان، ناکامی و نائومێدی.

هەمیشە بەرەودواوە چوون، ناپاکی و دواکەوتن هەیە. ئەوانەی کە بە گەورەیی بیر دەکەنەوە یان ئاواتی گەورەیان هەیە، کۆسپی گەورەتر لە رێگەی سەرکەوتندا بەرەو خۆیان رادەکێشن.

**(جۆن گرەی)**

## (مەرجی یارمەتی)

خودا ئەو کاتە زۆرترین یارمەتی دەخاتەڕوو کە تۆ هەموو ئەوەی کە لە تواناتا هەیە ئەنجام بدەیت.

**(جۆن گرەی)**

## (سەندنەوەی هەڵبژاردن)

کاتێک ئەوانیتر وەکو هۆکاری دڵتەنگی خۆتان باس دەکەن، دەسەڵاتی گۆڕینی ژیانتان بۆ ئەوانیتر جێ دەهێڵن.

(جۆن گرەی)

## (جیاوازی لە کوێوە دەست پێدەکات)

جیاوازیی بنەڕەتی نێوان ئەوانەی کە لە ژیاندا سەرکەوتوو دەبن و ئەوانەی کە شکست دێنن لە زانینی چۆنێتی هەڵسانەوەدایە.

(جۆن گرەی)

## (دەتەوێ دنیا قبوڵت بکات؟)

- تا ئەو کاتەی کە خۆتان قبوڵ نەکەن دنیا قبوڵتان ناکات.

(جۆن گرەی)

## (گومانکردن)

گومان لە گومانەکانی خۆتان بکەن.

(جۆن گرەی)

## (دەست کراوەیی و زەنگینی)

دەست کراوەیی بریتییە لە بەخشینی زیاتر لەوەی کە لەتوانادایە و زەنگینی بریتییە لە وەرگرتنی کەمتر لەوەی کە پێویستتە.

**(جۆن گرەی)**

## (تەڵاقدانی نەفس)

تۆ ناتووانیت سەرکەوتووانە لەگەڵ کەسێکدا هاوسەرگیری بکەیت مەگەر ئەوەی کە خۆت تەڵاق دابێت.

**(جۆن گرەی)**

## (عەرەبانەی رۆح)

ئەفلاتونی فەیلەسوفی یۆنانی لە نامەکەیدا بەناوی (فایۆرا) رۆح وەکو عەرەبانەیەك پیشان ئەدات کە دوو ئەسپی باڵدار رایدەکێشن. یەکێك لە ئەسپەکان لە نەژادی رەسەن و جوان و نەجیبە و ئەویتریان لە نەژادی نزم و لاسار. ئەسپە رەسەنەکە بریتییە لە هێزەکانی ئەقڵ و ئەسپی نزم هەوا و ئارەزووی نەفسانی ئێمەیە کە هەستی وەکو توڕەیی و چاوچنۆکی لێوە سەرچاوە دەگرێت. ئەرکی هەریەك لە ئێمە ئەوەیە کە بەدرێژایی ژیانمان عەرەبانەکە لە رێگای راستدا بەرەو پێش ببەین و بەسەر هەوای نەفسماندا زاڵ بین و هێزی ئەقڵمان زیاد بکەین و وزەکانی ئەم دوانە هەماهەنگ بکەین.

**(جۆن گرەی)**

## (باوك يان دايكبوون له هەبوونى منالْ نييه)

وەكو چۆن هەبوونى پيانۆيەك ناتكات بە پيانۆژەن، هەبوونى منالّيش ناتكاتە باوك يان دايك.

(جۆن گرەى)

## (هەرقل)

هێزى عەشق بە ئەندازەيەكە كە دەتوانێت لە لاوازترين كەسان هەرقل دروست بكات.

(جۆن گرەى)

## (ياساى ئالتونيى دايك يان باوكبوون)

زۆربەى منالّان ئەوەى كە بە زمانياندا دێت دەبيستن. هەندێ لە منالّان ئەوەى كە دەيلێين ئەنجامى دەدەن، بەلاّم هەموو منالّان ئەو شتە ئەنجام دەدەن كە تۆ ئەنجامى دەدەيت.

(جۆن گرەى)

## (پێشبڕكێ)

كێشــەی بردنــەوە لــە پێشــبڕكێی مشــكەكاندا ئەوەیــە كــە هــەر بــە مشــكی دەمێنیتەوە.

(جۆن گرەی)

## (گەورە بە, فراوان بە)

دەفری بچوك زوو داخ دەبێت.

(جۆن گرەی)

مایس





پێشەنگی شارەزایەتییەكانی ژیانە لە جیهاندا، كتێبی (هونەری دۆزینەوەی هاوڕێ)ی ئەو، بووەتە بەرهەمێكی كلاسیك لە بواری پەیوەندییە تاكەكەسییەكاندا.

**دیل كارنگی** (١٨٨٨-١٩٥٥)



نووسەر، وتاربێژ و راوێژكاری كۆمەڵایەتی بەرجەستە و دیارە و بە سادەكردنەوەی شتە ئاڵۆزەكان ناسراوە. ناسراوترین بەرهەمی بریتییە لە (بەڕێوەبەری یەك خولەكی) كە زیاتر لە سیانزە ملیۆن دانەی لێ فرۆشراوە.

**(كێنت بلانكارد)** (١٩٣٩)

## (قسمەت)

(چارەنووس) لە ناوێكی بێ ناونراو هیچی تر نییە. چونكە شتێكی وەها بوونی نییە. (قسمەت)ی ئێمە لە پێشدا دیاری نەكراوە و هەر لەبەر ئەم هۆكارەشە كە ڕۆژانە هەوڵ دەدەین ژیانی خۆمان باشتر بكەین و بۆیە منداڵەكانمان دەنێرینە قوتابخانە تاوەكو ئایندەیەكی ڕووناكیان هەبێت. هەر لەبەر ئەوەشە كە لەكاتی نەخۆشیدا دەچینە لای پزیشك و دەرمان بەكار دەهێنین تاوەكو حاڵمان خراپ نەبێت.

(دیل كارنگی)

## (دروشمی ڕۆحێكی مەزن)

ڕۆحی گەورە لە ڕێگای گەیشتن بە ئامانجە گەورەكاندا، وای پێ باشە كە ڕووبەڕووی شكستی ڕەها بێتەوە نەك ئەوەی كە لە خۆی لە بەرەوپێشچوون لابدات.

سەركەوتن یان مەرگ: ئەمەیە دروشمی ڕۆحێكی مەزن!

(دیل كارنگی)

## (جیاوازیە لە مردوو)

نامەوێ فەیلەسوفانە بدوێم، تەنیا دەمەوێ بڵێم ئەگەر زیندوویت، دەبێ لە جوڵان بەردەوام بیت...
تەکان بدەیتە خۆت و دەنگە دەنگ بکەیت. بە کورتی لە مرۆڤی مردوو جیاواز بیت.

**(دیل کارنگی)**

## (سەرەتا)

هەموو هەنگاوێکی گەورە لە سەرەتادا (ئەستەم) دێتە بەرچاو.

**(دیل کارنگی)**

## (کپی)

زۆرێك لە مرۆڤەکان لەبەرئەوەی بەدوای شوێنێکی ئارامدا دەگەڕێن، هەر کپ و بێ جوڵە دەبن.

**(دیل کارنگی)**

## (گەڕانی جیاواز)

دۆڕاو، لە شوێنە دوورەکان بەدوای بەختەوەریدا دەگەڕێت، بەڵام براوە لەبەر پێی خۆیەوە سۆراخی دەکات.

**(دیل کارنگی)**

## (بیستنی واقیعیکی پۆزەتیف لە رەخنەدا)

رەخنـەی ناعادیلانـە بریتییـە لـە سـتایش بەشـێوەیەکی تـر و بـەو مانایەیـە کـە ئەوانیتر ئیرەییان جولاوە. بیرت بێت کە کەس شەق لە سەگی مردوو نادات.

**(دیل کارنگی)**

## (رەخنە)

کاتێك کە دوودڵ بوویت لەوەی قسەی توند و پڕ توانج ئاراستەی ئەوانیتر بکەیت ئەوا بیرت بێت کە بیبەری زۆر تامی خواردن تێکدەدات.

**(دیل کارنگی)**

## (کتوپڕی)

لەکاتی بڕیارداندا دەبێ لەپێشدا لایەنـەکان و رەهەنـدەکانی بابەتەکـە بـە وردی تـاووتوێ بکـەیت و پاشـان بـەبێ راڕایـی و لێبڕاوانـە هـەنگاو بنێیـت. کاتێـك لـە ئەسکەندەریان پرسی: (چۆن توانیت دنیا داگیر بکەیت؟)

وتی: (بە دوانەخستن و بڕیاردانی هاوکات).

**(دیل کارنگی)**

## (کار دەکەین تا کار نەکەین)

مرۆڤ کار دەکات تاوەکو کار نەکات. ئەگەر خەڵکی بە راستی حەزیان لە کارکردن بووایە، ئەوا ئێمە هێشتا بە دار زەویمان دەکێڵا و بارمان لە کۆڵی خۆمان دەنا.

**(دیل کارنگی)**

## (بێ گەڕانەوە)

دەتـــوانی ســامانی لەدەستچـوو بــە هــەوڵ و کۆشــش ســەرلەنوێ بەدەست بهێنیتەوە، زانستی فەرامۆشکراو بە خوێندنەوە بەبیر بێنیتەوە، بـەڵام کـات کـە لـە دەستچوو ئـەوا بـەهیچ شـێوەیەك بەدەست نایەتـەوە و بـۆ هەمیشـە دەچێتە نـاو قەڵەمڕەوی تاهەتاییەوە.

(چی بکەین بۆ ئەوەی لە گەڕاندا سەرکەوتوو بین؟)

باشترین ڕێگای سەرکەوتن لە گەڕاندا، بەشدارینەکردنە تیایدا.

**(دیل کارنگی)**

## (فەلسەفەلێدانی قەدەغە)

بێچووه ورچێك كه له رادەبەدەر فەلسەفەی لێدەدا، رۆژێكیان له دایكی پرسی: (دەمەوێ به رێگادا برۆم بەڵام نازانم ئاخۆ پەنجەی راستم لەسەر زەوی دابنێم و یان دوو پێی دواوه و یان هەرچوار دەست و پێ بەیەكەوه؟) دایكی وتی: (واز له فەلسەفەلێدان بێنه و برۆ!) ئەم چیرۆكه بۆ حاڵی ئەو كەسانه گونجاوه كه له ئەنجامدانی كارەكانی خۆیاندا گومان و راڕاییان زۆره.

(دیل كارنگی)

## (ئاقڵتر به بەڵام وا مەڵێ)

ئەگەر دەتووانیت ئاقڵتر به لەوانیتر، بەڵام ئەم قسەیەیان پێ مەڵێ. چونكه چاودێربوون بەسەر هەڵەكانی ئەوانیترەوه، رێگەیەكی زۆر باشه بۆ دوژمن دروستكردن و دانانان به هەڵەكانی خۆتدا رێگەیەكی باشه بۆ دەستپێكردنی هاوڕێیەتی.

(دیل كارنگی)

## (رازی سەركەوتن)

من زۆرجار هاوینان دەچوومه راوەماسی. ئەگەر لێم بپرسیت، ئەوا من عاشقی شیلك و خامەم، بەڵام زانیوومه كه ماسییەكان، لەبەر هۆكارێكی نادیار، حەزیان له كرمه. بۆیه كاتێك ماسیم دەگرت دەربارەی ئەو شتەی كه خۆم دەمویست بیرم

نەدەکردەوە شیلك و خامەم بە نوکی قولابەوە نەدەکرد بەڵکو کرمێك یان کوللەیەکم پێوە دەکرد و بە ماسییەکەم دەگوت:

(حەز دەکەیت بیخۆیت؟)

(بۆچی کاتێك توشمان ئەبێت بە توشی ئەو مرۆڤانەوە، ئەوەندە کەڵك لە لۆژیك وەرناگرین؟)

ئەگەر سەرکەوتن تاکە رازێکی هەبێ، توانای بینینی دنیایە لە چاوی لایەنی بەرانبەر و بینینی مەسەلەکانە لە گۆشەنیگای ئەوەوە.

**(دیل کارنگی)**

## (گۆڕین)

کەسێك کە لێمان تێدەگات، دەتووانێت بمانگۆڕێت.

**(دیل کارنگی)**

## (گۆڕان)

هەندێ کەس پیشەیان،ماڵیان، مۆبیلیاتیان، هاوڕێکانیان و تەنانەت هاوسەریشیان دەگۆڕن. بەڵام هەرگیز بیر لە گۆڕینی خۆیان ناکەنەوە.

**(کێنت بلانکارد)**

## (لە كوێ مەلە دەكەیت؟)

یـەكێك لـەو ماسـییانەی كـە كۆكـەرەوانی ژاپـۆنی ئارەزوومەنـدی كۆكردنـەوەین ماسـی كپـوری ژاپۆنییـە كـە نـاوی (كوی)یـە. خـاڵی سـەرنجڕاكێش لـەبارەی ئـەم ماسییەوە ئەوەیە كە ئەگەر بیخەیتە ناو گۆزەیەكی بچوكەوە ئەوا تەنیا پێنج شەش سـانتیمەتر گەشـە دەكـات. بـەڵام ئەگـەر ماسـی (كـوی) بخەیتـە نـاو كاسـەیەكی گەورەتر یان حەوزێكی بچوك پانزە بۆ بیست و پێنج سانتیمەتر گەشە دەكات.

ئەگەر بیخەیتە نـاو حـەوزێكی گـەورەوە، بـە ئەنـدازەی چـل و پێـنج سـانتیمەتر گەشە دەكات. بەهەر حاڵ، كاتێك ئەم ماسییە بكەوێتە ناو دەریاچـە واتـە شـوێنێك كە بتوانێت بە راسـتی گـەورە ببێـت، تەنانـەت ئـەو هێـزە گەورەیـەی دەبێـت كـە درێژییەكەی بگاتە نزیكەی مەترسێك!

قەبارەی ئەم ماسییە پەیوەندیی راستەوخۆی بـە ژینگەكەیـەوە هەیـە. قـەبارەی تاكەكانیش پەیوەندییان بە ژینگەكەیانەوە هەیە. كاتێك رێگە بە تاكەكان دەدەیت كـە لـە حـەوزێكی گـەورەدا مەلـە بكـەن، ئـەوانیش لـە لێهـاتوویی، كەسـایەتی و پەیمانیاندا گەشە دەكەن.

(كێنت بلانكارد)

## (خاڵی پۆزەتیڤ لە هەڵەدا)

(هەڵە)یەك گەواهیدەری ئەوەیە كە كەسێك هەوڵیداوە كارێك ئەنجام بدات.

(كێنت بلانكارد)

## (ئێمە و ژیان)

ژیان كێشەی بۆ ئێمە دروست نەكردووە، ئێمە كێشەمان بۆ ژیان دروستكردووە.

## (پرسیارە نوێكان، وەڵامە كۆنەكان)

پرسیار هەمیشە نوێیە، بەڵام وەڵام بۆی هەمیشە كۆنە.

## (پەروەردەی دروست)

پرسیارەكە پەروەردەكردنی منداڵ نییە، پرسیارەكە ئەوەیە كە دەبێ مامۆستا بە دروستی پەروەردە كرابێت.

## (هەڵەیەك)

ئێمە دەمانەوێ هەموو شتێك بگۆڕین جگە لە (خۆمان).

## (هەڵێ من ئەمریكیم!)

رۆژێكیان خانمێكی ئەمریكی هاتە لام و وتی: (من كوڕێكم لە جەنگدا لەدەستداوە و ئێستا دەمەوێ كوڕی دووەمم لە كوژران رزگار بكەم).

## (جياوازيى نيوان ئارەزوو و پابەندى)

ئـەو جياوازييـەى كـە لـەنێوان ئـارەزوو و پابەنديـدا هەيـە ئەوەيـە كاتێـك ئارەزوومەنـدى ئەنجامـدانى كارێكيـت، هـەر كاتێـك كـە ئاسـودە بوويـت ئـەنجامى ئەدەيت، بەلاّم كاتێك پابەنديت بە ئەنجامدانى كارێك، هيچ پۆزش و بيانوويەكت لىٚ قبولٚ ناكرێت.

(كێنت بلانكارد)

## (رەخنە لە هەولدان)

ئەوەندەى پەيوەندى بە كارێكەوە هەيە، تۆ يا ئەيكەيت يان نايكەيت! شتێك نييە بەناوى (هەولٚ ئەدەم).

(كێنت بلانكارد)

## (مەرجى يەكەم)

يەكەمين مەرجى دەرچوون لە تاقيكردنەوە، بەشداريكردنە تيايدا.

(كێنت بلانكارد)

## (كۆنە و نوى)

شتێكى نوێت نادرێتىٚ، مەگەر ئەوەى كە دەست لە كۆنەكان هەلٚگريت.

(كێنت بلانكارد)

حوزەیران





# كریشنا مورتی

(١٩٨٦-١٨٩٦)

فەیلەسوف و بیرمەندی هیندییە، خۆناسین و ئازادبوونی دەروونی، پوختەی بیرۆكەكانی كریشنا مورتی-یە.

## (بجولی)

ئەگەر تەکانێك نەدەیتە خۆت، ئەوا درەنگ یان زوو ژیان تەکانت ئەداتێ.

(کێنت بلانکارد)

## (سنوور)

بیرتان بێت، دەبێ سنوورەکان بە خەڵکی بڵێین کە دەتووانن چ کارێك بکەن نەك ئەوەی کە ناتووانن چ کارێك بکەن.

(کێنت بلانکارد)

## (بۆچی دەمانەوێت کەسێك بڕوخێنین؟)

ئەگەر من خۆمم قبوڵ بێت پێویستم بەوە نییە کە تۆ بڕوخێنم.

(کێنت بلانکارد)

## (کێشە و ڕێگەچارە هەر یەکن)

کێشەکە تۆیت بەڵام ڕێگەچارەش هەر خۆتیت.

(کێنت بلانکارد)

## (بڕوانە ئاوێنە)

ئەگەر دەتەوێ هۆکاری پەیوەندیداری ئیش نەکردنی کارمەندەکانت بزانیت، بڕۆ بەردەم ئاوێنە و بەدزییەوە لێی بڕوانە.

(کێنت بلانکارد)

## (لە کاتی نادیاریدا)

بەڕێوەبردن تەنیا بەرەوپێشچوونی کارەکان نییە لە ئامادەبوونی تۆدا، بەڵکو بەرەوپێشچوونی کارەکانە لە نادیاربوونیشتدا.

(کێنت بلانکارد)

## (بەشێوەیەکی یەکسان مامەڵە مەکە)

بۆ بەڕێوەبەرێکی بازرگانیی سەرکەوتوو، شتێکی نادادپەروەرانەتر لە مامەڵەی یەکسان نییە لەگەڵ کارمەندانی نایەکساندا.

(کێنت بلانکارد)

وتم: (تاکە ڕێگای ئەوەیە کە لێرە بەدوا نەڵێیت من ئەمریکیم. تا ئەو کاتەی کە خۆت بە ئەمریکی دەزانیت، ئەویتر خۆی بە ڕوسی دەزانێ، یەکێکی تر خۆی بە ئەڵمانی و کەسێکی تر خۆی بە ژاپۆنی لەقەڵەم بدات، ئەوا ئەنجامە حەتمییەکەی بریتییە لە جەنگ و ململانێ.

## (هاوژیی دەروونی)

ئەگەر من بزانم درۆزنم و بە ڕاستییەك لەقەڵەمی بدەم، ئەوا لەناکۆکیدا نیم لەگەڵ خۆمدا. کاتێك لە ناکۆکیدام لەگەڵ خۆمدا کە نازانم درۆزنم.

## (دوایین کردار)

دەشێ هەر کردارێك ئەنجامی دەدەیت دوایین کردارت بێت بۆیە بە دروستی ئەنجامی بدە.

## (چۆن چۆنی؟)

مرۆڤێك کە خۆی فریو دەدات چۆن دەتوانێ ئەویتر فریو نەدات؟ مرۆڤێك کە لەگەڵ خۆیدا درۆ دەکات چۆن دەتوانێت درۆ لەگەڵ ئەویتردا نەکات؟

## (خراپ لێكتێگەیشتن)

لە زۆرێك لەو بوارانەی كە ئێمە وەكو عەشق وێنای دەكەین، بەرجەستەكردنی نیازە چاوچنۆكەكانی خۆمانە لە رێگەی كەسێكەوە كە پێمان وایە عاشقی ئەوین.

## (حوكمدان)

گوێگرتن لە رێگەی حوكمدانەوە، گوێگرتن نییە.

## (رێگری گوێگرتن)

گوێگرتنی راستەقینە كاتێكە كە ئەقڵ ئەو شتانەی كە گوێبیستی دەبێت لەسەر بنەمای زانراوەكانی پێشووی خۆی لێك نەداتەوە. زانین و زانیاری رێگرە لەبەردەم گوێگرتن.

## (وەرچەرخان)

ئەگەر خۆت وەرنەچەرخێنیت چۆن دەتوانیت دنیا وەرچەرخێنیت!؟

## (ستەم)

یەکێك لە ستەمکارانەترین کارەکان ئەوەیە کە من وا لە مرۆڤەکان بکەم بەو جۆرە بیر بکەنەوە کە من دەمەوێت.

تەمموز







عـاریف و یـۆگی بـەناوبانگی هینـدی کـە تەمـەنی خۆی بۆ ڕێنماییە مەعنەوییەکان، خۆناسین و نەریتی دێرینەی تێڕامان تەرخان کرد.

## پاراماهانسا یوگاناندرا (١٨٩٣-١٩٥٢)





## دێبی فۆرد

نوسـەرێکە کـە نـاوی لـە پێڕسـتی پڕفرۆشـترین کتێبەکانی نیویۆرك تایمزدا جێی گرتووە. ئەو لـە بەرهەمەکانیدا خوێنەران فێر دەکات چۆن ژیریـی دەروونـی بەدەسـت بێـنن و لـەبارەی ژیانیانـەوە بزانن.

## (تاقیگەی پەیوەندییەکان)

پەیوەندی، ئاوێنەیەکە کە خۆت پیشان ئەداتەوە. پەیوەندی تاقیگەیەکە کە تۆ دەتوونیت خۆتی تیادا بدۆزیتەوە.

## (شۆڕشی دەروونی)

کەسێك کە سامانێکی زۆری هەیە لە شۆڕش دەترسێت. ئێمەش لە رووی دەروونییەوە سامانی زۆرمان بۆ خۆمان کەڵەکە کردووە، بۆیە بەهەمان ئەندازەی ئەو کەسە لە شۆڕشێك و وەرچەرخانێکی دەروونی دەترسین.

## (کۆیلەی باوەڕ)

زۆرێك لە مرۆڤەکان کۆیلەی باوەڕی ئەوانیترن.

## (ئاشتی و جەنگ)

تۆ چۆن دەتوونیت ئاشتی بێنیتە کایەوە لەکاتێکدا کە بەردەوام لەناو خۆت و لەگەڵ خۆتدا لە جەنگدایت!؟

## (فێرکردنی بیرکردنەوە)

لە منداڵییەوە فێرمان دەکەن کە بیر لە چی بکەینـەوە، فێرمـان ناکـەن چـۆن بـیر بکەینەوە.

## (بەها پێدان)

(گەمژەیی) واتە بەها دانان بۆ شتێك کە بەهای نییە.

## (لەنگەر گرتن)

ئەمەی کە ئەقڵ بیر لە رابـردوو بکاتـەوە جیایـە لەگـەڵ ئـەوەی کـە هەمیشـە لـە رابردوودا لەنگەری گرتبێت.

## (وەرچەرخانی کۆمەڵگە لە تاکەکەسەوە دەست پێدەکات)

چۆن چۆنی وەرچەرخانی بنەڕەتی لە کۆمەڵگە مومکین دەبێت تا ئەو کاتەی کـە تاکە تاکی مرۆڤەکان وەرنەچەرخێن!؟ کۆمەڵگە واتە تاکە تاکی مرۆڤەکان.

## (تەنزی ژیان)

ئێمە لە گەنجیدا دەڕوانینە ئاینده و لە پیریدا دەڕوانینە رابردوو.

## (رەتكردنەوەی شوێنكەوتەیی)

من ئەو كاتە شوێنكەوتەیی رەت دەكەمەوە كە روخساری مورشیدێك گرنگییەكی زیاتر لە رێنمایی و وتەكانی پەیدا دەكات.

## (خۆپەرستی)

كاتێك (من)ی تۆ دەیەوێ خزمەتی ئەوانیتر بكات، ئامانجەكە رازیكردنی (من)ە نەك خزمەتكردن.

## (رازیكردنی من)

تۆ دەتەوێ مرۆڤەكان بەناوی تۆوە بەختەوەر بن، ئەگەر لە رێگەی یەكێكی ترەوە بەختەوەر ببن ئەوا گرنگییەكی ئەوتۆی بۆ تۆ نییە، بۆیە بەختەوەریی مرۆڤەكان گرنگ نییە بەڵكو (من)ی تۆ گرنگە.

## (ئەقڵ و دڵ)

پەیوەندیی دڵ دوو لایەنە نییە چونکە (ئاڵوگۆڕ) و (مامەڵە) کاری دڵ نییە بەڵکو کاری ئەقڵە.

## (کۆتایی بیر)

ئەو مرۆڤەی کە دەڵێت: (من دەزانم) لە بیرکردنەوە وەستاوە.

## (لە گریمانەوە تا راستی)

خوداوەند، تەنیا بەسەر دڵێکدا رۆشن دەبێتەوە کە فەزیڵەتی تیایە نەك ئایدیا و تیۆرەی فەزیڵەت، بەڵکو واقیعی فەزیڵەت.

## (ئەودیو گەڕان)

ئێمە لە شتەکاندا (خۆ)مان دەبینین نەك واقیعی ئەو شتانە.

## (مەنزڵی هەموو رێگاکان)

بڕۆیتە هەر کوێیەك دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ خۆت.

## (عەشقی راستەقینە:عەشقی بێ کۆت و بەند)

جارێکیان ئیشرام (خانەقا)م جێ هێشت و لە شاخەکانی هیمالایا کەوتمە گەڕان بە دوای راستیدا. بەزوویی بۆم دەرکەوت کارێکی هەڵەم ئەنجام داوە و گەڕامەوە. کاتێک هاتمە لای مامۆستا وا رەفتاری لەگەڵدا کردم وەک بڵێی هەرگیز جێم نەهێشتووە. لەبری هەر جۆرە گلەیی و سکاڵایەک وتی:

(لێگەڕێ بزانم بۆ نانی بەیانی چیمان هەیە).

وتک: (بەڵام مامۆستا تۆ لە من تورە نیت؟)

لە وەڵامدا وتی: بۆچی تورە بم؟ من هیچ چاوەڕوانییەکم لەوانیتر نییە، بۆیە کارەکانیان ناتوانێ بە پێچەوانەی خواستەکانی من بێت. من وەکو ئامرازێک بۆ گەیشتن بە ئامانج تۆ بەکارناهێنم. من ئەو کاتە خۆشحاڵم کە تۆ بە راستی خۆشحاڵ بیت.

ئەگەر عەشقی من بەشێوەی بەرتیل سوودی لێوەربگیردرێت، چیتر عەشق نییە. ئەگەر ناچار بم رەفتارم لە ترسی کاردانەوەی تۆ بگۆڕم، کەواتە ئەو هەستەی بەرانبەر تۆ هەمە، عەشقێکی راستەقینە نییە، تۆ هەر کاتێک بتەوێ دەتوانیت جێمان بهێڵیت.

(پاراماهانسا)

## (نیگەرانی واتە مەرگ)

ئەو کاتەی کە نیگەرانیت، کاتی ناشتنی تەرمی تۆیە کە لەلایەن خودی خۆتەوە ڕێکخراوە. تۆ حەز ناکەیت لەلایەن نیگەرانییەکانتەوە لە گۆڕ نرێیت! بۆچی دەبێ هەموو ڕۆژێك ئازار بچەژیت و لە نیگەرانیدا بمریت؟

(پاراماهانسا)

## (کانگەی شادی)

شادی پەیوەندی نییە بە بارودۆخە دەرەکییەکانەوە بەڵکو پەیوەندی هەیە بە بارودۆخە ناوەکییەکانەوە.

(پاراماهانسا)

## (خودا چاودێری هەموو شتێکە)

(جۆن راسکین)ی رەخنەگری هونەری، لەکاتی بەسەرکردنەوەی کەنیسەیەکی قۆناغی رێنیسانس لە ڤینیسیا کە بینی پەیکەرێکی جوانی بەردەم دیوارێك تەنیا لایەکی هەیە، نارەحەت بوو. بەشەکانی دواوەی پەکەرەکە دیار و بەرچاو نەبوون. ئەو وتی: ئەم بەرهەمانە پێشکەشی خودا کراون نەك خەڵك و خودا دەتوانێت بەشی پشتەوەش وەکو بەشی پێشەوە ببینێت.

## (ژیان له‌سه‌ر بنه‌مای یاسا ده‌روونییه‌کان)

ژیر که‌سێکه که ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر هه‌موو یاساکانیش لابـبردرێن ئـه‌وا دیسـان هـه‌ر وه‌کو خۆی ده‌ژیت.

(پاراماهانسا)

## (راز و نیاز)

ئه‌زیزی دڵم سوێند بـه میهره‌بانییه‌کـه‌ت: هـه‌رگیز دره‌وشـانه‌وه‌ی خـۆری گۆنـای عه‌شقی من له‌ژێر ئاسۆی بیرم به‌رانبه‌ر تۆ ئاوا نابێت. هـه‌رگیز نیگـای خـۆم کـه لـه به‌رزییه ناهێنمه خواره‌وه که جگه له تـۆ ئاراسـته‌ی که‌سـێکی تـر بکرێـت. هـه‌رگیز کارێك ناکه‌م که بیرهێنه‌ره‌وه‌ی که‌سێك بێت جگه له تۆ.

(پاراماهانسا)

## (ئامۆژگاری مه‌خۆره روو، چاکه بکه)

هیچ ئامۆژگارییه‌ك ناتوانێ وه‌کو وه‌جبه‌یه‌ك خواردنی باش دیدی مرۆڤـی برسـی به‌رانبه‌ر جیهان چاك بکات.

(پاراماهانسا)

## (ڕیژەییبوونی کات)

ڕۆژێکیان خزینی مێرولەیەکی بچوکم بەسەر تەپۆلکەیەکی گەورەی گوێچکەماسیدا بینی، لەبەر خۆمەوە وتم: (حەتمەن ئەم مێرولەیە پێی وایە بەسەر شاخەکانی هیمالایادا سەر دەکەوێت!)

لەوانەیە ئەم تەپۆلکەیە بەلای مێرولەکەوە زۆر گەورە بێت، بەڵام بەلای منەوە وەها نەبوو. ئەم مەسەلەیە سەبارەت بەساڵەکانی ڕووناکیشەوە ڕاستە کە بەلای خواوە کەمتر لە خولەکێکن.

(پاراماهانسا)

## (تاکانەیی)

فێر بن خوداوەند لە ڕوخساری مرۆڤەکاندا ببینن لە هەر نەژاد و گروپێک بن. کاتێک پەی بە عەشق دەبەیت کە هەست بکەیت لەگەڵ هەموو مرۆڤێکدا گەیشتوویتە تاکانەیی نەک پێش ئەو.

(پاراماهانسا)

## (دەرکەوتن)

حەزرەتی حەق لە ڕێگەی ئێمەوە دەردەکەوێت کە بە بەخشینی ئارامی بەوانیتر، پڕاوپڕ دەبین لە خۆشی.

(پاراماهانسا)

## (خۆناسین)

كەسایەتی ڕاستەقینەی تۆ كاتێك دەست بە گەشە دەكات كە بتووانیت بە نێرامانی قووڵ بگەیتە ئەو ڕاستییەی كە تۆ تەنیا ئەو جەستە مادیە نیت بەڵكو پرۆسەی تاهەتایی ژیان و هۆشیاریی ئەم جەستەیت.

(پاراماهانسا)

## (خەیاڵ)

پاشایەك لە خەویدا بینی كە پیاوێكی هەژارە. ئەو لە خەویدا بۆ فلسێك و بڕێك خۆراك دەگریا. دواجار شاژن لە خەو هەڵیساند. وتی: (ئەوە چیتە؟ گەنجینەی تۆ پڕە لە ئاڵتون و تۆ هێشتا بۆ فلسێك دەگریت؟)

پاشا وتی: (من چەند گەمژەم، پێم وابوو دەرۆزەكەرێكی هەژارم و خەریكی گریانم چونكە پارەم پێنەبوو).

ئەمەش خەیاڵ و گومانی هەموو تاكەكەسێكە كە پێی وایە كەسێكە لە گیانەڵادایە و مەحكومە بە هەموو جۆرە مۆتەكەیەك، لە نەخۆشییەوە بگرە تا ئازار و ناڵە و بێ دەرەتانی.

(پاراماهانسا)

## (بۆچی شەیتان بەشێکە لە دنیای بوون؟)

شـەیتان هاودژییـەك دێنێتـە کایـەوە کـە بەهۆیـەوە دەتـووانین باشـی بناسـین و ئـەزموون بکـەین. ئەگـەر بڕیـار بـووە دنیایـەکی بـوون هـەبێ کەواتـە شـەیتانیش دەبووایە هەبێت. ئەگەر تـۆ بـە گەچـی سـپی پـەیامێك بنووسـیت کـەس ناتووانێت بیخوێنێتەوە. بەبێ تەختەڕەشی شەیتان تۆ ناتووانیت تایبەتمەندیی باش بە گەورە پیشان بدەیت.

**(پاراماهانسا)**

## (مەرجی فێربوون)

مرۆڤ تا ئەو کاتەی کە لە (ناسراو)وەوە بەرەو (نەناسراو) نەڕوات هیچ شتێك فێر نابێت.

**(پاراماهانسا)**

## (دانایی)

دوو فریشتە لە شەودا لە سەفەردابوون. یەکەم جار گەیشتنە ماڵی خێزانێکی دەوڵەمەند. پاشان داوایان لێکردن تا شەو لەوێ بەسەر ببەن. پیاوە دەوڵەمەندەکە لەبری ئەوەی کە یەکێك لە ژوورە زۆرەکان بۆ میوانەکانی تەرخان بکات، ژێرزەمینێکی بچوك و ساردی بۆ دیاریکردن. کاتێك ئەوان دوو پێخەفی خۆیان لەوێ لەسەر زەویی سارد و سڕ ڕێکدەخست، فریشتە بەتەمەنەکە کونێکی بە دیوارەکەوە بینی و چاکی کردەوە. شەوی دواتر، پاش سەفەرێکی درێژ ئەوان چوونە ماڵی جوتیارێکی هەژار، بەڵام پێشوازییان لێکرا. جوتیار و هاوسەرەکەی خۆراکی کەمی خۆیان لەگەڵیاندا دابەشکرد و میوانەکانیان لە پێخەفی خۆیاندا خەواند.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، فریشتەکان جوتیار و هاوسەرەکەیان بینی کە دەگریان. بۆیان دەرکەوت کە ئەو مانگایەی هەیانبوو و سەرچاوەی بژێویان بوو لە کێڵگەکەدا مردووە. فریشتە گەنجەکە لە فریشتەکەی تری پرسی: (چۆن ڕێگەتدا ئەمە رووبدات؟ یارمەتیت خێزانەکەی یەکەمتدا کە پیسکە و نامیهرەبان بوون، کەچی ڕێگەتدا مانگاکەی ئەم خێزانە هەژار بەڵام بەخشندە و میهرەبانە بمرێت کە هەموو شتێکیان لەگەڵماندا بەش کرد؟) فریشتە پیرەکە بە میهرەبانییەوە وەڵامی دایەوە: (ڕووداوەکان هەمیشە بەو شێوەیە نین کە دیارن! لە ژێرزەمینی ماڵی ئەو پیاوە دەوڵەمەندەدا من بۆم دەرکەوت کە لەناو کونی دیوارەکەدا کەمێك ئاڵتون شاردراوەتەوە و کاتێك بینیم ئەو ژن و مێردە چەنێك چاوچنۆك و پیسکەن، کونەکەم داپۆشی تا نەتووانن ئاڵتونەکە بدۆزنەوە.

دوێـنـێ شـەو کاتێـک ئێمـە خـەوتبووین، فریشـتـەی مـەرگ هاتـە سـۆراخی ژنـە جوتیارەکە. من تکام لێی کرد کە گیانی مانگاکـە لـەبری ئـەو ژنـە بکێشێت، بۆیـە هەلومەرجەکە هەمیشە بەو شێوە نین کە دیارن!

کاتێك بیرمان بێت کـە هەمیشـە حیکمـەتێك بەسـەر جیهانـدا زاڵـە و رووداوەکان هەمیشـە بـەو جـۆرە نـین کـە دێنـە بەرچـاو، دەتـوانین لـە سـەروو خۆپەرستی و بەرنامەی رۆژانەی ژیان، خۆمان ببینین.

(دێبی فۆرد)

## (بەهەندوەرنەگرتن)

شاونی، سەرۆکی خێڵی (تکومسێ) جارێکیان وتـی: (ئەگـەر هـیچ شـتێك نابینیـت کە بەرانبەری سوپاسگوزار بیت، دڵنیابە کەموکورییەکە لە تۆوەیە).

کاتێك ئێمە بەشێوەیەکی بەردەوام بەدوای چێژی تـر، دارایـی تـر، یـان ئامـانجی پیشەیی دواتردا دەگەڕێین، لەوانەیە ئـەو شـتانە بەهەنـد وەرنـەگرین کـە ئێسـتا لـە بەردەممانن).

(دێبی فۆرد)

## (رۆحیەتان بەندە بە خۆتانەوە)

خوداوەند ئەفرێنەری تۆیە، بەڵام تۆ بە هەڵبژاردنی خۆت،

کاریگەری لەسەر چارەنووسی خۆت دادەنێیت.

(دێبی فۆرد)

## (چارەی کێشە)

گوزارشتی (دەبێ کار بکەم) هەمیشە کێشەی زیاتر چارە دەکات نەك گوزارشتی (دەبێ شتێك بکرێت).

**(دێبی فۆرد)**

## (تەنیا یەکێك.....)

لەناو ملیاردەها سپێرم تەنیا یەکێکیان دەتوانێت ببێتە مرۆڤ و لەناو ملیۆنەها مرۆڤ تەنیا یەکێکیان دەتوانێ ناودار ببێت. بەڵام لەناو هەموو گیانلەبەرانی بووندا تەنیا یەکێکیان دەتوانێت (من) بێت...

**(دێبی فۆرد)**

## (بڕیارنەدان جۆرێکە لە بڕیار)

ئەگەر هێشتا بڕیارێکت نەداوە بەو مانایەیە کە بڕیارێکت داوە.

**(دێبی فۆرد)**

## (ئاواتی خاو)

ئاواتم ئەوە بوو لەوانیتر جیاواز بم، لەکاتێکدا کە ڕێك ئەوانیتر ڕەفتارم دەکرد...

**(دێبی فۆرد)**

# (نەخۆشیی سەرقاڵی)

سەرقاڵی یەکێکە لە نەخۆشییەکانی سەردەمی ئێمەیە. ئەم نەخۆشییە، وزەمان هەڵدەلوشێت و لاوازمان دەکات و سەرەنجام خەونەکان، هەستکردن بە زەنگینی و جۆش و خرۆشمان لەناو دەبات.

سیستەم و دیسپلین تاکە رێگای چوونەدەرن لەم مۆدێلە خۆ رووخێنەرە. ناتووانین بە سیستەم و دیسپلین مشتومڕ بکەین. سیستەم و دیسپلین لێت ناپرسێت ئاخۆ ئارەزووی ئەنجامدانی ئەم کارەت هەیە یان نا و تەنانەت دەرفەتی هەڵبژاردنیشت ناداتێ. دەنگی سیستەم و دیسپلین دەڵێت: (ئەمە، بەرنامەی کارە. وتوومە ئەم کارە ئەکەم، کەوایە ئەیکەم).

دەبێ ببووریت و لە دڵی نەگریت، بەڵام دیسپلین باکی بە بیرکردنەوەی تۆ نییە. بەهیچ شێوەیەك گرنگی بە بیانوو پۆزشی تۆ نادات و تەنیا سەرکەوتنی تۆی بەلاوە گرنگە. ئێمە دەبێ لەم خەیاڵە بێینە دەرەوە کە ئەمڕۆ بڕارەمان لەبەردەمە کە ئەمڕۆ ئەم کارە ئەنجام نەدەین.

(دێیی فۆرد)

## (پابەندی بە بڕیارەكانەوە)

خەڵیك لای من ئەناڵێنن:

(دێبی، ئەم كارە زۆر سەختە!)

بەڵام لە راستیدا ئەم كارە ئەوەندەش دژوار نییە. ئەزانیت دژواری لە كوێدایە؟ ژیان لەگەڵ خۆتاندا، ئەو كاتەی كە پابەند نین لە پابەندییەكانتانەوە. ئەنجامدانی كارەكان، بەدیسپلینبوون، گەڵاڵەكردنی پلان بۆ گەیشتن بە ئامانجەكان و پەیڕەویكردن لەو پلانە ئاسانترە لەوەی كە بڵێیت چیت ئەوێت، بەڵام هەر ئەمڕۆ و سبەی بكەیت و هیچ هەنگاوێك نەنێیت. ئەم رەفتارەیە كە كارەكە قورس دەكات.

ئەم رەفتارە لەسەر هەستكردن بە زەنگینیت گران دەكەوێتەوە، بەرانبەر رۆحیەی تۆ رووخێنەرە، قورسە لەسەر دڵتان و بۆ دەوروبەرتان زۆر ناخۆشە. دەتووانیت ئەم بابەتە لە هەر كەسێك بپرسیت كە باجی ئەمڕۆ و سبەی كردنی داوە.

**(دێبی فۆرد)**

## (خۆشی و شادی لە كوێیە؟)

خۆشی لە شتەكاندا نییە، لە ئێمەدایە.

**(دێبی فۆرد)**

## (پیریی راستەقینە)

هیچ کەسێك بە بەسەربردنی چەندساڵێك پیر نابێت. خەڵکی تەنیا بە وێڵکردنی خەونەکانی خۆیان پیر دەبن. تێپەڕینی ڕۆژگار گنج لە روخسار دروست دەکات، بەڵام دەست شتن لە تامەزرۆیی و چالاکی، گنج لە گیاندا دروست دەکات.

**(دنێبی فۆرد)**

تاب





## برایان ترەیسی

(١٩٤٤)

برایان ترەیسی مامۆستایەکی ئەفرێنەرە کە لەسەروو زانین و دەروونناسییەوە دەپرژێتە سەر گەشە و پەرەپێدانی توانا تاکەکەسی و ڕێکخراوەییەکان و لە ئاقار بەرزکردنەوەی ئەنگێزە و شارەزایەتییەکانی بەڕێوەبردنی فرۆش و بازارڕدۆزیدا ناوێکی پڕشنگدارە.

## (پرسیار لە ملیۆنەرێك)

جارێکیان لە (پۆل گێتی)ی کە لەو رۆژگارەدا دەوڵەمەندترین پیاوی جیهان بوو لێیان پرسی بۆچوونت چییە لەبارەی (سەرکێشی)؟ لە وەڵامدا وتی، کاتێك دەچمە ناو مامەڵەیەکی بازرگانییەوە یەکەمین پرسیار کە دەیکەم ئەمەیە:

(خراپترین رووداو کە دەشێت رووبدات چییە؟)

پاشان هەموو هەوڵێك ئەدات تا ئەم خراپترین رووداوە روونەدات.

## (چاوەڕوانیی نابەجێ)

قازانجکردنی بێ سەرکێشی

ئەزموونکردنی بێ مەترسی

پاداشت وەرگرتنی بێ هەوڵدان

وەکو ئەوە وایە بێ ئەوەی لەدایك بیت، چاوەڕێی ئەوە بیت بژیت.

## (یەکسانبوونی راستەقینە)

مەتەوێ کارەکەت بە ئەندازەی توانات بێت، خوازیاری ئەوە بە تواناکانت بگەنە ئاستی خواستەکانت.

## (مرۆڤ و بارودۆخ)

ئـەوە بـارودۆخ نییـە کـە مـرۆڤ دروسـت دەکـات، ئـەوە مرۆڤـە کـە بـارودۆخ دەخولقێنێت.

## (خوو)

گۆتە دەڵێت: (هەموو شتێك بەر لەوەی سادە بێت دژوارە). هێنانەکایـەی خـووە باشەکان کارێکی دژوارە، بەڵام ژیان لەگەڵیاندا ئاسانە.

## (بەڕێوەبردنی کات)

کاتی تۆ، ژیانی تۆیە. کاتێك لـە گـرنگترین کارەکانتـدا هـەوڵ ئـەدەیت، باشـترین کەڵك لە ژیانی خۆت وەردەگریت. هەر کارێك جگە لە کاری گرنگت ئـەنجام بدەیت، بەهەدەردانی کاتە.

## (گریمانەی گرنگ)

من بە ئەزموون بـۆم دەرکـەوتووە کـە هـەموو تاکەکەسـە لێهـاتوو و کاراکان لە چارەکردن و هەڵبڕینی کێشەکان، پێش هـەموو شـتێك گریمانـەی ئـەوە دەکـەن کە ڕێگاچارەیەکی سادە و لۆژیکی لە چاوەڕوانیاندایە.

سەرەنجام، بە ڕۆحیەتی پڕاوپڕ لە بڕوابەخۆبوون، مکوڕ دەبن و دەچنە دوایان.

## (پرسیار)

دوایین جار كە شكستت هێنا: هەوڵتدا هەوڵی خۆت بەهۆی شكستەكە بوەستێنیت، یان لەبەرئەوە شكستت هێنا كە هەوڵی خۆت وەستاند؟

## (چوار پرسیاری گرنگ)

چوار پرسیاری گرنگ هەن كە بۆ بوون بە كەسایەتیەكی بەرز دەتوانیت لە خۆتیان بكەیت. ئەم چوار پرسیارە بەمشێوەیەی خوارەوەن:

١-دنیایەكی چۆنمان دەبوو ئەگەر هەموو ئەو كەسانەی تیایدان وەكو من بوونایە؟

٢-وڵاتێكی چۆنمان دەبوو ئەگەر هەموو ئەو كەسانەی تیایدان وەكو من رەفتاریان بكردایە؟

٣-كۆمپانیایەكی چۆنم ئەبوو ئەگەر هەموو كارمەندەكانی وەكو من بوونایە؟

٤-خێزانێكی چۆنم ئەبوو ئەگەر هەموو كەسانەی تیایدان وەكو من رەفتاریان بكردایە؟

## (راستییەكی ئیلهامبەخش)

تۆیان هێناوەتە ئەم دنیایەوە تا لە ژیانی خۆتدا كارێكی سەرسوڕهێنەر بكەیت.

## (مەحكوم بە شكست)

ئەگەر پێت وایە بۆ شادی و خۆشبەختی تۆ دەبێ کەسێکی تر بگۆڕێت، ئەوا مەحکومیت بە شکستهێنان.

## (کرداری یان راست و درووست؟)

پێش ئەوەی بزانیت ئەنجامدانی چ کارێك کردارییە، بزانە ئەنجامدانی چ کارێك راستە.

## (خوێندن گرنگ نییە)

نیوەی دەرچووانی زانکۆکان لە خزمەتی ئەو کەسانەدان کە تەنانەت قۆناغی خوێندنی ناوەندیشیان تەواو نەکردووە.

## (لەگەڵ چ کەسانێکدا خۆمان بەراورد بکەین)

ئەو کەسانەی کە بڕوایان بەخۆیانە خۆیان بەوانیتر بەراورد ناکەن تەنیا خۆیان لەگەڵ ئەو باشترین کەسەدا بەراورد دەکەن کە دەتووانن ببن.

## (نایاب بە)

بە بڕوای من خەم و خەفەتی زۆرێک لە خەڵکی جیهان لەبەر ئەوەیە کە هەر کاتێک لە بەیانیدا هەڵدەستن و سەیری ئاوێنە دەکەن، ڕووبەڕووی کەسێک دەبنەوە کە لە هیچ شتێکی تایبەتدا (جیاواز) نییە. بە بڕوای من هەریەک لە ئێمە دەبێ بگاتە ئەو بڕوایەی کە لە بوارێک لە بوارەکاندا خاوەنی تایبەتمەندییەکی باڵایە و دەتوانێت بەشێوەیەکی تاکانە و تایبەت، شتێکی بەهادار پێشکەشی خەڵکی جیهان بکات.

## (تەرکیز لەسەر خاڵێک)

لەبری ئەوەی کە لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا لەسەدا یەک یان دوو سوودمەند بیت، هەوڵ بدە لە بوارێکی تایبەتدا لەسەداسەد شارەزا و بەئەزموون بیت.

## (دوو گروپ کە شکست دێنن)

شکست هی دوو گروپە:

–گروپی ئەو کەسانەی کە پێیان وایە دەتوانن هەموو کارێک ئەنجام بدەن.

–گروپێکی تریش کە وێنای پێچەوانەی ئەمە دەکەن!

## (بایەخی نزیکایەتی)

نزیکایەتی لەگەڵ براوەکان براوەیەکت لێ دروست دەکات و دانیشتنت لەگەڵ دۆڕاوەکان دۆڕاوێکت لێ دروست دەکات.

## (هەڵبژاردنی ڕێگا)

هۆکاری گەورەی شکستی خەڵك ئەوەیە کە ئامادە نین بەرگەی سەختی و ناخۆشییە زۆرەکان بگرن بەڵکو تەنیا ئارەزوومەندی ئەوەن لەو ڕێگایانەدا هەنگاو بنێن کە لەپێشدا هەموار کراوە و تێپەڕین پیایدا پڕە لە خۆشی و سەرگەرمی.

## (ئایندە هی کێیە؟)

ئایندە هی ئەو کەسە سەرکێشانەیە کە بە ئیرادەیەکی تۆکمەوە سنووربەندی و کۆسپە بە رواڵەت تۆقێنەرەکانیان لابردووە. ئەوان ترسیان لەبەرانبەر هەموو شتێکی نادیار و نەناسراو کۆنترۆڵ کردووە و جیاوازی دروست دەکەن.

## (گوزارشتی جادوویی)

ئەو گرنگترین خووەی کە دەتووانیت بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن و بەختەوەری لە خۆتدا دروست بکەیت، دووبارەکردنەوەی گوزارشتی (من دەتووانم هەر کاتێک بمەوێ سەرکەوتوو بم)ە.

## (کلیلی بڕوابەخۆبوون)

کلیلی بڕوابەخۆبوون ئەوەیە کە سەرەتا بڕیار بدەیت کە چیت ئەوێ و پاشان بۆ گەیشتن بە خواستی خۆت بەجۆرێك رەفتار بکەیت کە وەك بڵێی شکست بوونی نییە.

## (لە هیچەوە تا هەموو شتێك)

حیکایەتی سەرکەوتووترین مرۆڤەکان، حیکایەتی ئەو کەسانەیە کە لە هیچەوە دەستیان پێکرد و گەیشتنە ئەنجامی بەهادار.

## (ئاوات یان ئامانج؟)

خەڵکی ئاسایی هیوا و ئاواتیان هەیە

کەسانی بڕوابەخۆبووش، ئامانج و بەرنامەیان هەیە.

## (پلاندانان)

پلان دانەنان، پلاندانانی شکست و بێ بەرهەمییە.

## (وەکو کریستۆف کۆلۆمبەس مەبە)

هەمووان دەیانەوێ شاد و بەختەوەر بن. بەڵام گەیشتوومەتە ئەو ئەنجامەی کە هەموو نابەختەوەرەکان ئەو کەسانەن کە لە ژیاندا سۆراخی ئامانج ناکەن. ئەو کەسانەی کە بەختەوەر نین سۆراخی ئامانجێکی دیاریکراو ناکەن لە ژیاندا. ئەوان وەکو کریستۆف کۆلۆمبەسن کە بێ ئەوەی بزانێ رێگای سەفەری گرتەبەر. کاتێک گەیشتە سەرزەمینێکی نوێ نەیزانی گەیشتووەتە کوێ. کاتێکیش گەڕایەوە وڵاتی خۆی، دیسان نەیدەزانی لەکوێوە هاتووە. زۆر کەس لەم هەلومەرجەدا دەژین.

## (چۆن قسە بکەیت)

ئەگەر دەربارەی باشترین شت لەم دنیایەدا بۆ مرۆڤایەتی پرسیارم لێ بکەن، دەڵێم:

(سەرتان بەرز راگرن، سەیری کێشەکان بکەن و بڵێن: من لە ئێوە گەورەترم، ناتووانن تێکمبشکێنن).

## (تایبەتمەندی)

بچوکترین هەنگاو، لە گەورەترین بڕیار باشترە.

## (یاسای وێنەدانەوە)

کاتێك بەرانبەر ئاوێنەیەك دەوەستیت و وێنەی خۆتی تیادا دەبینیت، دەزانیت ئەم وێنەیە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو شتەی دەدرێتە ئاوێنەکە دروست دەبێت. کاتێك دەروانیتە هەر بەشێك لە بەشەکانی ژیانت، بۆت دەردەکەوێت کە تێڕوانین و باوەڕەکانت وێنەدانەوەیان بۆت هەیە. تۆ دنیا نەك بەو شێوەیەی کە هەیە بەڵکو ئەو شێوەیەی کە هەیت و دەتەوێ، تەماشا دەکەیت، بوونت لە ناختدا دەریدەخات لە دەرەوەتدا چی ئەگوزەرێت.

## (خۆراکی ئەقڵ)

وەکو چۆن ئەو شتەی دەیخۆیت کاریگەریت لەسەر دادەنێت، ئەوەشی کە ئەیدەیتە ئەقڵت، کاریگەرە.

ئەیلول



٢



# نیل دۆناڵد وۆڵش

وۆڵش لە خێزانێكی ئایینی لە (میلڤاكی)ی ئەمریكا هاتووەتە دنیاوە. دایكی نیـل وەكو یەكـەمین مامۆسـتای مەعنـەوی، فێـری منداڵەكـەی كـرد كـە نابێـت لـە خـودا بترسێت. نیل پاش كەوتن و هەڵسانەوەی بێشومار لە ژیانـدا، سـەرەنجام لـە سـاڵی ١٩٩٢ یەكەمین كتـێبی خـۆی بـە سـێ بـەرگ بڵاوكـردەوە بەناوی (گفتوگۆ لەگـەڵ خوادا) كە بەزوویی بووە پڕفرۆشترین كتێبی جیهان– ئەو لەگەڵ نانسی هاوسەریدا، بە جیهاندا دەگەڕێت و لەگەڵ خەڵكیدا ئەدوێت تا پێیـان بڵێـت لەگـەڵ خـوادا قسـە بكەن.

## (خولقاندنی بەڕێکەوت)

من فێربووم کە شتێك بەناوی ڕێکەوت نییە و کاتێك ئامانجەکانت روون بن، خوداوەند لە ڕێگەی ڕووداوە هاوکاتەکان، بەرنامەی ئێمە ڕێکدەخات. چەندەی هۆشیارانەتر بژیت، پەی بە ڕووداوی (ڕێکەوت)ی زۆرتر ئەبەیت لە ژیاندا.

## (کێشەکە خۆمانین)

ئەگەر لە ژیاندا ئەو شتەی ئاواتتە پێی ناگەیت لەبەرئەوە نییە کە خوداوەند نەیویستووە وەلامگۆی نزاکانت بێت، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە ئەوەی بیری لێدەکەیتەوە، ئەوەی دەیڵێیت و کاری پێدەکەیت پێچەوانەی ئەو شتەیە کە ئاواتتە پێی بگەیت.

## (تۆ هەڵدەبژێریت)

هەرچییەکیت خۆت هەڵیدەبژێریت کە وەها بیت. ئەگەر بۆ ساتێك نیگەرانیت لەبەرئەوەیە کە نیگەرانبوونت هەڵبژاردووە. ئەگەر دڵخۆشیت، لەبەرئەوەیە کە هەڵتبژاردووە. ئەگەر نارەحەتیت، لەبەرئەوەیە کە ئەم دۆخەت هەڵبژاردووە. ئەگەر ماندوویت لەبەرئەوەیە کە ماندووبوونت هەڵبژاردووە. ئەگەر خۆشەویستیت لەبەرئەوەیە هەڵتبژاردووە. ئەگەر دڵشکاویت دیسان ئەو بارودۆخەت هەڵبژاردووە. ئەگەر ژیریت لەبەرئەوەیە کە هەڵتبژاردووە. ئەگەر هەست دەکەیت ستەمدیدەیت،

لەبەر ئەو هۆکارەیە کە ئەم حاڵەتەت هەڵبژاردووە. ئەم پێڕستە دەکرێ تاهەتایە درێژ بکریتەوە.....

## (جیاوازیی نێوانی بیرکردنەوە و فێربوون)

منـالان هـان دەدەن بـۆ (فێربـوون) نـەك بـۆ (بیرکردنـەوە)ی زۆر. بیرکردنـەوە پەیوەندی هەیە بە توێژینەوەی بیروباوەڕ. بەڵام فێربوون تەنیا پەیوەندی هەیە بـە لەبەرکردن.

## (ژیانت پەیامتە)

(پەیامی تۆ) شێوازی ژیانی تۆیە. تۆ پەیامەکە لە ڕێگەی بوونی خۆتـەوە تیشـك ئەدەیتەوە.

## (دوو پرسیار)

ئەگەر (تۆ) نا، ئەی کێ؟ و ئەگەر ئەم ساتە نا، ئەی کەی؟

## (لە کانگەی عەشقەوە)

چالاکی سیاسی یان مەعنـەویی کاریگـەر، هـیچ کاتێـك لـە کانگـەی تـوڕەیی یـان نەفرەتەوە سەرهەڵنادات، بەڵکو لە کانگەی عەشقەوە جوڵە دەکات.

## (گرنگترین بڕیار)

گرنگترین بڕیار کە ئەیدەیت ئەوەیە کە چ کەسێکیت؟

## (کەسێك نییە جگە لە تۆ)

لەگەڵ ئەوانیتردا بەو شێوەیە رەفتار بکە کە خۆت ئەتەوێ رەفتارت لەگەڵدا بکرێت، چونکە لە راستیدا کەسێك جگە لە تۆ بوونی نییە.

## (ئێمە هەمووومان یەکین)

تەنیا یەك پەیام دەتووانێت بۆ هەمیشە مێژووی مرۆڤایەتی وەرچەرخێنێت، کۆتایی بە ئازار و رەنجەکان بێنێت و بتگەڕێنێتەوە بۆ لای خودا. پەیامەکەش ئەمەیە: ئێمە هەمووومان یەکین.

## (کەلتووری بەرایی، کەلتووری پێشکەوتوو)

ئەوەی کە ئەمڕۆ لە کەلتووری تۆدا بە (سەرکەوتن) ناودەبرێ تا ئاستێکی زۆر بەو شتەی کە تۆ (بەدەستی دێنیت) بە شانازی، پارە، دەسەلات و ئەو سامانەی کە کۆت کردووەتەوە دەپێورێت. لە کەلتووری نوێدا (سەرکەوتن) بەو برەی کە تۆ دەبیتەهۆی ئەوەی کە ئەوانیتر (کۆی بکەنەوە) پێوانە دەکرێت.

## (له هەر دەستێکەوە بدەیت لەو دەستەش وەردەگریتەوە)

هەر شتێك كە لەوانیترت دەوێ بدە بەویتر. هەرشتێکت لە دنیا دەوێ بیدە بە دنیا. هەرچییەك كە لە ژیانت دەوێ بیدە بە ژیان. كانگە و سەرچاوەی شتێك بە كە ئاواتتە بەدەستی بێنیت.

## (ئاستەكانی راستگۆیی)

راستگۆیی لە پێنج ئاستدا دەکرێت:

١-لەبارەی خۆتەوە لەگەڵ خۆتدا راستگۆ بە.

٢-لەبارەی ئەویترەوە لەگەڵ خۆتدا راست بە.

٣-لەگەڵ ئەویتردا لەبارەی ئەوانیتر راست بە.

٤-لەبارەی ئەوانیتر لەگەڵ ئەویتردا راست بە.

٥-لەبارەی هەموو شتێکەوە لەگەڵ هەمواندا راست بە.

## (عەشق پەرچەکردار نییە)

تۆ خەڵکت لەبەرئەوەی كە هەن خۆش دەوێ یان لەبەر ئەوەی كە هەیت؟ عەشقی راستەقینە بەرهەمی بڕیارێکە كە دەربارەی رەفتاری خۆت لەبەرانبەر ئەویتر ئەیدەیت. ئەگەر بڕیاری تۆ پەرچەکردارێك بێت كە بەرانبەر کرداری ئەویتر ئەیخەیتەڕوو چیتر عەشق نییە بەڵکو هەستێکی ساختەیە.

## (گەڕیدە مەبە)

هەمووان بەدوای شتێکدا دەگەڕێن کەوایە تۆ گەڕیدە مەبە، بەڵکو هەر ئەو کەسە بە کە ئەوانیتر بەدوایدا دەگەڕێن.

## (پێویستبوون لەناو بە)

گەورەترین دیاری کە ئەتوانی بیدەیتە کەسێك ئەوەیە کە توانا و هێزی ئەوەی بدەیتێ پێویستی بە تۆ نەبێت و بۆ هیچ شتێك پێویستی بە تۆ نەبێت.

## (هەمووومان یەك خێزانین)

خێراترین ڕێگە بۆ گەیشتن بە عەشق و هەستی هاوخەمی بەرانبەر هەموو مرۆڤایەتی ئەوەیە کە هەموو مرۆڤەکان وەکو ئەندامانی خێزانی خۆت ببینیت.

## (گەورەترین ناپاکی)

ئەگەر بۆ خۆلادان لە ناپاکی بەرانبەر گروپ ناپاکی بەرانبەر خۆت بکەیت، ئەوا لە هەر بارێکدا بێت ناپاکیت کردووە و ئەمەش گەورەترین ناپاکییە.

## (هەڵبژاردن)

بەردەوام هەر ئەوەیان هەڵبژێرە کە خودا هەڵیدەبژارد.

## (گەورەترین تەحەدی)

خوداوەند جگە لە بێگەردی نەیخولقاندووە. بۆیە ژیان تەواوە، وەکو چۆن خودا تەواوە. تاکە تەحەدی بەردەممان بینینی ئەم تەواوییەیە.

## (گرنگترین پرسیار)

گرنگترین پرسیار کە نەژادی مرۆڤ لەبەردەمیدایە ئەوە نییە کە تۆ چ کاتێکی ژیان وانەیەك فێر دەبیت بەڵکو ئەوەیە کە چ کاتێك کار بەو شتانە دەکەیت کە فێریان بوویت؟

## (زۆرترین قوتابی، زۆرترین مامۆستا)

مامۆستایەکی راستەقینە ئەوە نییە کە زۆرترین قوتابی هەبێت، بەڵکو کەسێکە کە زۆرترین مامۆستا پێبگەیەنێت.

## (سێ تایبەتمەندی)

یەکێك دەیگوت هەموو کەسێك بۆ گەیشتن بە مەزنایەتی تەنیا سێ تایبەتمەندی پێویستە:

ئازایەتی! ئازایەتی! ئازایەتی!

ئەو ڕاستی دەکرد.

## (پابەندی بە بەها دەروونییەکان)

ڕێگە بە خۆتان مەدەن بۆ بژێوی کارێك بکەن کە قوڵترین هەستی دەروونیی، بوونتان بسڕێتەوە.

## (مەوەستە)

لاوازترین کار لە ژیاندا ئەوەیە کە دەست نەدەیتە تەقەلا و هەوڵ، چونکە وا وێنا دەکەیت کە لە پێشدا دەزانیت ئەنجامەکە چی دەبێت. ئەم مەسەلەیە وزە دەوەستێنێت تەنانەت پێش هەوڵدانەکەش. پێش کارەکە، خۆت مەوەستێنە.

## (له جۆری دووه‌میان به‌)

ده‌کرێ بڵێین به‌ گشتی دوو جۆر مرۆڤ له‌سه‌ر زه‌وی هه‌یه‌: یه‌کێکیان مرۆڤی (دووباره‌که‌ره‌وه‌) و ئه‌ویتریان مرۆڤی (گۆڕه‌ر). دووباره‌که‌ره‌وه‌کان ئه‌و که‌سانه‌ن که‌ ده‌ڕواننه‌ رابردوو و ئه‌وه‌ی که‌ له‌ رابردوودا روویداوه‌ دووباره‌ی ده‌که‌نه‌وه‌ و گۆڕه‌ره‌کان ئه‌و که‌سانه‌ن که‌ ده‌ڕواننه‌ رابردوو و ئه‌و شته‌ی که‌ ئێستا له‌ رووداندایه‌ ده‌گۆڕن تا دووباره‌بووه‌وه‌ی رووداوه‌کانی رابردوو نه‌بێت. تۆ ده‌توانیت ببیته‌ یه‌کێك له‌ گۆڕه‌ره‌کان.

## (ره‌خنه‌گر یان وه‌رچه‌رخێنه‌ر)

تۆش ده‌توانیت وه‌کو نیوه‌ی خه‌ڵکی جیهان بیت، جیهانێك که‌ له‌به‌رئه‌وه‌ی به‌پێی ئاره‌زووت نه‌بووه‌ چه‌ند جارێك ره‌خنه‌ت لێگرتووه‌، ده‌شتوانی وه‌رچه‌رخانێك بیت که‌ ئاره‌زوومه‌ندی ته‌ماشاکردنیت له‌م جیهانه‌دا.

## (پێوه‌ری هه‌ڵسه‌نگاندن)

ئه‌گه‌ر تۆ پێویستت به‌ پێوه‌رێك بێت که‌ به‌هۆیه‌وه‌ بتوانیت حوکم بده‌یت چ شتێك بۆ نه‌ژادی مرۆیی باشه‌ یان نا، ئه‌م پرسیاره‌ ساده‌یه‌ له‌ خۆت بکه‌: ئه‌گه‌ر هه‌مووان ئه‌م کاره‌یان ئه‌نجام بدایه‌ چی رووی‌ده‌دا؟

## (ئازادی)

ئه‌مه‌ی كه‌ ئه‌وانیتر سه‌ربه‌ست بكه‌یت له‌ پابه‌ندبوون به‌ په‌یمانه‌كان و ناچاریان نه‌كه‌یت به‌ڵێن بده‌ن، له‌وانه‌یه‌ له‌ كورت مه‌ودا دا به‌ زیانی تۆ ته‌واو بێت. به‌ڵام له‌ دوورمه‌ودا دا هه‌رگیز زیان به‌ تۆ ناگه‌یه‌نێت. چونكه‌ كاتێك تۆ ئازادیی كردار ئه‌ده‌یته‌ ئه‌ویتر، له‌ راستیدا ئازادیت به‌ خۆت داوه‌. هه‌ر ئه‌مه‌ش تۆ له‌ ئازار و خه‌می زیان گه‌یشتن به‌ هه‌ستی به‌هاداریت ده‌رباز ده‌كات كه‌ له‌ ئه‌نجامی فشاری تۆ بۆ سه‌ر كه‌سێك تا پابه‌ند بێت، رووده‌دات.

تشرینی یەکەم



٢



## دیپاك چۆپرا-وئەوانیتر

دکتۆر دیپاك چۆپرا (بە رەچەڵەك هیندی) سەرۆك و بونیادنەری دامەزراوەی پزیشکیی (ئایورودا)یە. ئەو بۆ بەشداربووانی سیمینارەکانی لە کۆلێژەکانی پزیشکیی ئەمریکا تا رێکخراوی تەندروستیی جیهانی و رێکخراوی نەتەوەکان لە نیویۆرك وتاری پێشکەش کردووە.

(جیم رێد فیڵد)، (تۆنی بازەن)، (ئەریك فرۆم)، (ماکسوێل مالتز)، (جۆرزێف مورفی)، (سانیا رومان)، (دون خوان)، (میگێل روین)، (جیرالد جمبالسکی)، (سکۆت پەك)، (ساتیا سایی بابا)، (ین میلمن)، (سپنسەر جۆنسن)، (ناتانیل براندن)، (ریچارد کارلسون)، (ئەلبێرت ئەلیس)، (ئاگ ماندینو)، (ئەبراهام مازلۆ)، ( خوزێ سیلڤا)، (کارین هورنای)، (دەیڤد برنز)، (گورجییێف)، (پال تویچیل).

## (تەمەن)

تەمەن تەنیا ژمارەیە.

(دیپاك چۆپرا)

## (عەشقی خودایی)

هیچ شتێك نییە ئەنجامی بدەین تا خودا زیاتر خۆشی بوێین. هیچ شتێكیش نییە كە بتووانین ئەنجامی بدەین تا خۆشەویستی خوا بۆ ئێمە كەمتر بێتەوە.

(دیپاك چۆپرا)

## (عەشق چیمان لەگەڵدا ئەكات)

مارلین، ئارتۆری گەیاندە شوێنێك كە خۆرەتاو لە نیوەڕۆدا تیایدا دەدرەوشایەوە. مۆمێكی داگیرساو لە دەستی مارلیندا دەركەوت، لەبەرانبەر خۆردا رایگرت و پرسی: (ئایا دەتووانیت ببینیت كە رووناكە یان نا؟)

ئارتور وتی: (نا، خۆر ئەوەندە درەوشاوە بوو كە گڕی مۆمەكەی نادیار كردبوو).

مارلین وتی: (ئێستا سەیر بكە). تۆپێك لۆكەی لای مۆمەكە دانا و لۆكەكە دەستبەجێ داگیرسا.

كوڕەكە پرسیاری كرد: (ئەمە چ پەیوەندییەكی بە عەشقەوە هەیە؟) بەڵام مارلین وەڵامی نەدایەوە. تەنیا وەنەوشەیەكی كێوی هەڵگرت و گوشی و دوو دڵۆپە

له شیلەکەی دڵۆپاندە سەر پەنجەکانی ئارتور و فەرمانیدا: (تامی بکە). ئارتور روخساری گرژ کرد: (زۆر تاڵە).

مارلین ئەوی بردە کەناری دەریاچەیەك و پێی وت دەستەکانی بشووات. ئینجا فەرمانی پێکرد: (ئێستا تامی ئاوەکە بکە، ئایا تۆزقاڵێك تامی تاڵی ئەدات؟)

ئارتور وتی: (بەڵام ئەمە چ پەیوەندی بە عەشقەوە هەیە؟) مارلین ئەمجارە وەڵامی نەدایەوە، بەڵام کوڕەکەی بردە ناو قووڵایی زیاتری دارستان و بە هێمنی وتی: (ئارام دانیشە). ئارتور هەر بەو شێوەیەی کە پێی وترابوو دانیشت. پاش چرکەساتێك مشکێك چەند مەترێك لەولاوە خزایە ناو سەوزاییەکەوە. سێبەرێك بەسەریاندا تێپەڕی. بەڵام پێش ئەوەی مشکەکە بتوانێت بجولێت، هەڵۆیەك بەرەو ئاسمان بەرزی کردەوە و بە نێچیرەکەیەوە بەرەو هێلانەکەی لە بەرزایی شاخەکان، فڕی. ئارتور بە گێژی و سەرگەردانییەوە وتی: (خۆ تۆ وتت وانەی عەشقت فێر دەکەم. بەڵام ئەوەی کە پیشانتدام چ پەیوەندی بە عەشقەوە هەیە؟)

مامۆستاکەی وتی: (گوێ بگرە. وەکو مۆمێك کە لەبەرانبەر خۆرەتاودا نادیارە، خۆپەرستی تۆ لە هێزی بەرگەنەگیراوی عەشقدا شی دەبێتەوە. وەکو تامێکی تاڵ کە هەرکاتێك دەریاچە بیشواتەوە هەستی پێناکرێ. تاڵیی ژیانیشت هەر جارێك کە لەگەڵ عەشق تێکەڵاو بێت، وەکو تازەترین ئاو، شیرین دەبێت و وەکو نێچیرێك کە هەڵۆکە رفاندی، گرنگ دەرکەوتنیشت لە چاوی عەشقێکدا کە قووتت ئەدات وەکو خاڵێکی بچوك دەردەکەوێت).

(ئەکسیر)

## (درێژترین سه‌فه‌ر)

هه‌ندێ جار له‌ ژیانتاندا ده‌چنه‌ سه‌فه‌ر، له‌وانه‌یه‌ ئه‌م سه‌فه‌ره‌یان درێژترین سه‌فه‌رتان بێت. سه‌فه‌رێك بۆ دۆزینه‌وه‌ی خۆتان.

**(جه‌یمز فیڵد)**

كاره‌ گه‌وره‌كان مرۆڤی گه‌وره‌ ئه‌نجامی ده‌ده‌ن.

**(تۆنی بازه‌ن)**

## (عه‌شق واته‌....)

عه‌شق واته‌ یه‌كێتی له‌گه‌ڵ كه‌سێك یان شتێكی ده‌ره‌وه‌ی خۆت، به‌ مه‌رجی پاراستنی جیاوازی و یه‌كپارچه‌یی بوونی خۆت.

**(ئه‌ریك فرۆم، ئه‌ڵمانیا ١٩٠٠–١٩٨٠)**

## (تێپه‌ڕینی ژیان)

چۆنێتی به‌سه‌ربردنی رۆژانی ژیانمان له‌ راستیدا به‌ واتای چۆنێتی به‌سه‌ربردنی ژیانمان دێت.

**(ماكسوێل مالتز)**

## (كۆتایی توڕه‌یی)

كۆتایی توڕه‌یی، شه‌رمكردنه‌.

**(جۆزێف مورفی)**

## (ئازار)

کاتێکی زۆری خایاند تا تێگەیشتم کاتێك رقم لە کەسێکە هیچ ئازار و زیانێك بەو ناگات بەڵکو ئەوە تەنیا منم کە ئازار دەچێژم.

(سانیا رومان)

## (دڵنیایی لە پشت سەرمانەوەیە)

هیچ رێگایەکی روون لە پێشمان نییە. هەموو رێگا روون و دیارەکان لە پشت سەرمانەوەن.

(فلۆرانس سکۆلشین)

## (گرەنتی ئایندە)

هەر کارێك کە ئێستا ئەنجامی ئەدەیت دەشێ دوایین کارت بێت لەسەر زەوی. دەشێ دوایین خەباتی تۆ بێت. هیچ هێزێك لەم دنیایەدا ناتووانێت زامنی ئەوە بکات کە تۆ خولەکێکی تر زیندوو ئەبیت.

(دۆن خوان-کاستاندا)

## (هەر ئێستا دەتووانیت لە بەهەشتدا بژیت)

بەهەشت یان دۆزەخ هەر ئێستا و هەر لێرەیە. پێویست ناكات چاوەڕێ بكەیت تا بمریت، ئەگەر بەرپرسیارێتی ژیان وكارەكانت بگریتە ئەستۆ، ئەو كاتە ئاینده لە دەستی تۆدایە و تۆ دەتووانیت لەهەمان كاتدا كە جەستەت زیندووە، لە بەهەشتدا بژی.

**(میگێل روین)**

## (بەخشین)

بەخشین واتە ئەوەی كە زیندانییەك ئازاد بكەیت و بۆشت دەركەوێ كە بەندییەكە خۆتی.

**(سكۆت پەك)**

## (عەشقی مەرجدار)

زۆربەی ئەو شتانەی كە ئێمە لە ژیاندا بە عەشق ناوی دەبەین لە جۆری عەشقی مەرجدارە كە لەسەر بنەمای دەگمەنی، بە دانوستان و كڕین و فرۆشە. وشەی دیار لە عەشقی مەرجداردا (ئەگەر)ە. عاشقی تۆ دەبم ئەگەر بە ویستی من رەفتار بكەیت. ئەگەر لەگەڵ ئەو قاڵبەدا گونجاو بیت كە لە ئەقڵمدا دروستمكردووە ئەوا عاشقی تۆ دەبم. ئەگەر نمرەی باشتر بێنیت، ئەگەر لەكاتی خۆیدا لە ئیش بگەڕێیتەوە، ئەگەر رۆژی لەدایكبوونمت بیر بێت، ئەگەر هەستێكی زۆرتر لە خۆت

بخەیتەڕوو و هاوسەرێکی باشتر بیت، ئەگەر جگەرە نەکێشیت، ئەگەر خۆت لاواز بکەیت، ئەگەر سکالا نەکەیت...

ئەگەر کەسی بەرانبەر خواستەکانی ئێمە جێبەجێ بکات یان بەپێی ئارەزووی ئێمە بگۆڕێت، هەست بە خۆشحاڵی دەکەین. ئەگەر ئەو خواستەکانی ئێمە نەهێنێتە دی یان نەگۆڕێت نارەحەت و نائومێد دەبین و کاتێکیش کە نارەحەتی و دڵتەنگییەکان کەڵەکە دەبن ئەوا دەبنە توڕەیی و قین.

**(جیرالد جمبالسکی)**

## (هەڵە مەکەن)

ئامانجی ژیان بردنەوە نییە. ئامانجی ژیان گەشەکردن و بەشداریکردنە. کاتێك ئاوڕدەدەیتەوە دواوە و ئەو کارانەی لە ژیانی خۆتدا ئەنجامت داوە، لەو خۆشییەی بە ژیانی کەسانی ترت داوە چێژی زیاتر وەردەگریت نەك ئەو کاتانەی کە پێشیان کەوتوویتەوە و شکستت پێ هێناون.

**(جولیا کامیرۆن)**

## (پێدان و وەرگرتن هەر یەکە)

پێدان و وەرگرتن یەکە، بۆیە بە یارمەتیدانی ئەوانیتر لە راستیدا یارمەتی خۆمانمان داوە.

**(ساتیا سایی بابا)**

## (دەستی خوداوەند)

هیچ شتێك له ژیاندا لەوه شیرینتر نییه كه كەسێك مرۆڤـی خـۆش بوێـت. مـن لـه ژیانی خۆمدا هەركاتێك تێگەیشتبم كەسێك خۆشی دەوێـم، وەكـو ئـەوه وابـووه كـه هەست به دەستی خوداوەند لەسەر شانی خۆم بكەم.

(دان میلمەن)

## (پێناسەی بلیمەت)

بلیمەت كەسێكه كه بەردەوام بیرۆكەكانی له هێزەوه دەكاته كردار.

(سپنسەر جۆنسۆن)

## (دەرەنجام)

به ئاسانی دەتـوانین خۆمـان لـه ژێـر بـاری بەرپرسـیارێتی قوتـار بكـەین بـەڵام ناتوانین له دەرەنجامەكانی رابكەین.

(ناتانێل براندن)

## (بەهای رێنوێنی و چاكەی خوداوەند)

دەسته رێنوێنەكان، دەستەكانی خودان.

(ریچارد كارلسۆن)

## (چوار وەرز)

چوار کەس لە چوار وەرزدا درەختێك بە چوار شێوە دەبینن، لە حوکمداندا پەلە مەکەن.

**(ئەلبێرت ئەلیس)**

## (سپاردن)

ئاینده بە باشترین دەستەکان بسپێرە، ئەو دەستانەی کە هی خودی خۆتن.

**(ئەبراهام مازلۆ)**

## (دوو جۆر نارازی)

مرۆڤە نارازییەکان دوو پۆلن: ئەو نارازییانەی کە کار دەکەن و ئەو نارازییانەش کە تەنیا دەستەکانیان لە یەکتری قوفڵ دەکەن. یەکەمیان ئەوەی کە دەیەوێ بەدەستی دێنێت و دووەمیان ئەوەشی کە هەیەتی لەدەست دەدات. بۆ ئەوەی یەکەمیان چارەیەك نییە جگە لە سەرکەوتن و بۆ دووەمیان هیچ چارەیەك نییە.

**(ئاگ ماندینۆ)**

## (كاره‌سات)

كاره‌ساتی ژیان ئه‌وه نییه كه زوو كۆتایی بێت، به‌ڵكو ئه‌وه‌یه یه‌كجار زۆر بۆ ده‌ستپێكردنی چاوه‌ڕوان بین.

**(خوزێ سیلڤا)**

## (چه‌مكی ژیان)

چه‌مكی ژیان له هه‌بوونی هه‌موو شتێك، زیاتره.

**(كارین هۆرنای)**

## (ده‌رەنجامه‌كانی نائومێدی)

له ئاینده‌ی نائومێده‌كاندا هیچ شتێك روونادات.

**(ده‌یڤد برنز)**

## (مرۆڤ ئاوێنه‌ی خوداوه‌ند)

هه‌ر مرۆڤێك ئاوێنه‌یه‌ك كه هێزی خوداوه‌ند تیایدا ره‌نگی داوه‌ته‌وه.

**(گورجییێف)**

## (دوو هەڵبژاردن)

تۆ دوو ڕێگات لەبەردەمدایە:

یەکەم گۆڕینی ئەقڵیەت بەرەو هۆشیاری

دووەم سەلماندنی ئەمەی کە پێویستت بە گۆڕینی ئەقڵیەت نییە

تەقریبەن هەموو خەڵك ڕێگەی دووەم ئەگرنە بەر.

(پال تویچل)

تشرینی دووەم





بازرگـــــان، وەبـــــەرهێن و نووســــەری بەناوبانگترین کتێبی (باوکی دەوڵەمەند، بـاوکی هـــەژار) وانـــەی کـــرداری و گـــرنگ لـــەبواری بەڕێوەبردنی سەرچـاوە داراییـەکان پێشکەشـی خەڵك دەکات.

**ڕۆبەرت کیوساکی-١٩٤٧**





نووســەر و وتاربێــژی ناســراو، لــە بــواری خــۆ پێگەیانـدن، هەسـتکردن بـە زەنگینی و چارەسـەری خێزانیدا.

**فیلیپ مەکگرا- ١٩٥٠**

## (هۆش یان بوێری؟)

زۆرجار لە دنیای واقعیدا، ئەوە هۆش و ئاگایی نییە كە مرۆڤ بەرەو پێش دەبات بەڵكو بوێرییە كە بەرەو پێشەوە ئاراستەی دەكات.

(ڕۆبەرت كیوساكی)

## (ڕازیلك)

ژمارەیەكی كەمی خەڵك هەن كە دەزانن بەخت قابیلی خولقاندنە.

(ڕۆبەرت كیوساكی)

## (جیاوازی)

ئاستەكانی خـوارەوە و ناوەنـدی كۆمەڵگـە بـۆ پـارە ئـیش دەكـەن، بـەڵام دەوڵەمەندەكان پارە دروست دەكەن.

(ڕۆبەرت كیوساكی)

## (ڕووخێنەرترین وشە)

رووخێنەرترین وشە، (سبەینێ)یە.

(ڕۆبەرت كیوساكی)

## (خاڵی لاوازی فێرکردن)

هۆکاری سەرەکی کە دەبێتەهۆی ئەوەی زۆربەی خەڵکی لە تەنگانەی داراییدا بژین ئەوەیە کە ئەوان ساڵانێکی زۆری تەمەنی خۆیان لە قوتابخانەکاندا بەسەر دەبەن بەڵام هەرچی پەیوەندی بە پارەوە هەیە هیچ فێر نابن. ئەنجامەکەش ئەوەیە کە خەڵکی تەنیا فێری ئەوە دەبن بۆ پارە ئیش بکەن....

بەڵام هیچ کاتێك فێر نابن چی بکەن تا پارە ئیشیان بۆ بکات.

(رۆبەرت کیوساکی)

## (رێگای دەوڵەمەند بوون)

تەنیا ئەو شتەی کە لە مێشکی تۆدایە، دیاری دەکات کە چ شتێك لەدەستتاندا بێت. پارەی ئێوە بیرۆکەیەکە. ئەگەر دەتانەوێ پارەی زیاترتان دەست بکەوێت، بە ئاسانی بیرکردنەوەتان بگۆڕن.

(رۆبەرت کیوساکی)

## (بیرکردنەوەی دەبەنگانە)

لە شەوێکی ساردی زستاندا، پیاوێك بە باوەشێك دارەوە، لەبەردەم سۆپایەکی گەورەی دار دانیشتبوو و بەسەر سۆپاکەدا هاواری کرد: (هەرکاتێك تۆ گەرمات بەخشییە من، ئەوا دارت دەخەمە ناو!) کاتێکیش مەسەلەی پارە، عەشق، شادی، فرۆشتن و مامەڵە دێتە بەر باس، دەبێ هەموومان بیرمان بێت کە پێش هەموو شتێك ئەوەی دەمانەوێت بیبەخشین تاوەکو پۆل پۆل دەستمان بکەوێتەوە.

(رۆبەرت کیوساکی)

## (نیشانە)

براوەبوون واتە نەترسان لە دۆڕان. لە ژیانی کەسیی خۆمدا تێگەیشتووم کە سەرکەوتن هەمیشە بەدوای دۆڕانێکدا دێت.

(رۆبەرت کیوساکی)

## (قبوڵکردنی سەرکێشی)

لە هەموو ئەو ساڵانەی کە بەسەرم بردوون، هەرگیز رێکەوتی دەوڵەمەندێکم نەکردووە کە لە ژیانیدا لانی کەم جارێك پارەی لەدەست نەدابێت. بەڵام لەبەرانبەردا خەڵکێکی بێ پارەی زۆرم بینیووە کە هەرگیز لە ژیاندا فلسێکیان لەدەست نەداوە.

(رۆبەرت کیوساکی)

## (پەندی تەکساسی)

ئەگەر پارەکەت کەمە و دەتەوێ دەوڵەمەند ببیت پێش هەموو شتێك پێویستە هێزی (سەرکێشی) پەیدا بکەیت نەك خۆپارێزی. تەکساسییەکان پەندێکیان هەیە کە دەڵێت: (هەمووان حەز دەکەن بچنە بەهەشت بەڵام کەس حەز ناکات بمرێت...)

هەموو خەڵك ئارەزووی دەوڵەمەندبوونیان هەیە بەڵام لە زیانی دارایی دەترسن. بۆیە قەت ناچنە بەهەشت.

(رۆبەرت کیوساکی)

## (خستنەکار)

مرۆڤێکی ئاقڵ و هۆشیار هەمیشە ئەو کەسانە دەخاتە سەر کار کە لە خۆی هۆشیارترن.

(رۆبەرت کیوساکی)

## (بەرهەمی فێربوون)

قوتابخانەکان بۆ پەروەردە و خولقاندنی کارمەندانی باش دروستکراون نەك خاوەنکارانی باش.

(رۆبەرت کیوساکی)

## (مێژوو)

ئێمە تەنیا ناو و بەروارەكانمان لە مێژوو بیر دەمێنێتەوە نەك وانەكانی.

(ڕۆبەرت كیوساكی)

## (هەست)

لە بیركردنەوەدا كەڵك لە هەستەكانت وەربگرە نەك ئەوەی كە بە هەستەكانت بیر بكەیتەوە.

(ڕۆبەرت كیوساكی)

## (ڕاستكردنەوەی دەربڕین)

هەر جارێك گوێم لێ دەبێت كەسێك پێم دەڵێت: (تۆ ناتووانیت ئەم كارە ئەنجام بدەیت). بیریان دێنمەوە كە وا باشترە بڵێن: (من هێشتا نازانم چۆن ئەم كارە ئەنجام بدەم....)

(ڕۆبەرت كیوساكی)

## (ڕۆڵی هۆشیاری)

زانیارییەكانت باشترین سامانتن و ناهۆشیاریتان گەورەترین مەترسی سەر ژیانتە.

(ڕۆبەرت كیوساكی)

## (رازی دەوڵەمەندبوون)

زۆرجار خەڵکی هەرگیز براوە نین، چونکە زیاتر بیر لە شکست دەکەنەوە و لێی دەترسن. هەر لەبەر ئەمەیە کە من قوتابخانەکان بە دەبەنگ لەقەڵەم دەدەم. ئێمە لە قوتابخانەکاندا ئەوە دەخوێنین کە هەڵەکان شتی خراپ نین و بۆ ئەنجامدانیان خۆمان بە شایستەی سزا دەبینین. بەڵام بە ئەنجامدانی هەڵەیە کە ئێمە فێربووین و شارەزا بووین. ئێمە بە کەوتنە سەر زەوی، فێری ڕۆیشتن بە ڕێگادا بووین. ئەم مەسەلەیە لەبارەی دەوڵەمەندبوونیش ڕاستە. هۆکاری بنچینەیی ئەمەی کە زۆربەی خەڵکی دەوڵەمەند نین ئەوەیە کە لە زیان پێگەیشتن دەترسن.

**(ڕۆبەرت کیوساکی)**

## (دنیای دۆڕاوەکان و براوەکان)

براوەکان لە شکست ناترسن. بەڵام دۆڕاوەکان دەترسن. شکست بەشێکە لە پرۆسەی سەرکەوتن. ئەو خەڵکەی لە شکست خۆ بەدوور دەگرن، لە سەرکەوتنیش خۆ بەدوور دەگرن.

**(ڕۆبەرت کیوساکی)**

## (لەدایکبوونی خەون)

نیوەی خەونەکانتان لە ئەقڵدا و نیوەی تریان لە کرداردا لەدایک دەبن.

**(فیلیپ مکگرا)**

## (قەسابی ژاپۆنی)

باشترین بەشی گۆشت لە قەسابە ژاپۆنییەکە داوا کرا. وتی: (هەمووی باشترینە! من شتێك نافرۆشم کە باشترین نەبێت).

**(فیلیپ مکگرا)**

## (بەهای ئامۆژگاری)

ئامۆژگارییە ژیرییەکان بەهادارن. ژیرەکان کتومت دەزانن کە چ شتێك مەحاڵە و تەنانەت دەشزانن بۆچی مەحاڵە. هەموو ئەو کارەی کە دەبێ تۆ ئەنجامی بدەیت ئەوەیە کە بۆیان بسەلمێنیت بەهەڵەدا چوون.

**(فیلیپ مکگرا)**

## (دوو جۆر کار)

توانای کەسەکان بەو کارانە نییە کە دەستیان پێکردووە بەڵکو بەو کارانەیە کە تەواویان کردووە.

**(فیلیپ مکگرا)**

## (هیچ شتێك مەحاڵ نییە!)

شقارتە، ئاگرێکە هەڵدەگیرێت. پێش داهێنانی، خەڵکی بەم بیرۆکەیە پێدەکەنین، رێك وەکو ئەوەی کە ئەمڕۆکە کەسێك داهێنانی سیستەمی فێنککەرەوە بە قەبارەی قەڵەمێك، پێشنیار بکات.

**(فیلیپ مکگرا)**

## (پێشینانی نەوەکانیت)

گرنگ نییە شانازی بە پێشینەکانت بکەیت، ئەوەی گرنگە شانازیکردنی ئەوانە بە تۆوە.

(فیلیپ مکگرا)

## (جیاوازیی ئاسمان و ڕیسمانە)

هەندێ کەس هەرکوێیەك بچن خۆشی لەگەڵ خۆیان دەبەن. هەندێ کەسیش هەرکاتێك بچن خۆشی دەهێنن.

(فیلیپ مکگرا)

## (شوێنی دایك و باوك)

ژیان، کتێبی فێربوونی نییە و هەر لەبەرئەوەشە کە هەموومان دایك و باوکین.

(فیلیپ مکگرا)

## (دەمەوێ....)

دەمەوێ بەو جۆرە بژیم کە شەوەکانم پڕ نەبن لە حەسرەت و داخ.

(فیلیپ مکگرا)

## (ژیان پێشبڕكێیەكی وەرزشییە)

یاریی ژیان، پێشبڕكێیەكەی توندە. هەندێ جار مەودای نێوان سەركەوتنێكی گەورە و شكستێكی گەورە زۆر كەمە. لەكاتی تەماشاكردنی پێشبڕكێی یاریی سەلە و تۆپی پێدا، ئەبینین كە هەندێ جار براوە تەنیا بە یەك گۆڵ دیاری دەكرێت كە ئەویش لەوانەیە بە تۆرەی خۆی بەهۆی جوڵەیەك یان سستییەكەوە یاریزانێكی ناو بارودۆخە هەستیارەكان بێت. ژیان زۆر لە پێشبڕكێی وەرزشی دەچێت. ئەو كارە زۆر بچوكانەی كە ئەنجامی دەدەیت یان ئەنجام نادەیت، دەتوانێ ئیمتیازێكی هەستیارت بداتێ كە دەبێتەهۆی سەركەوتن یان لێت بسەنێت.

(فیلیپ مكگرا)

## (رۆژێك لە رۆژان....)

هەر كەسێك لە كەسەكان رۆژێك لە رۆژان (هیچ كەس) بوو بە بیرۆكەیەكی جوان و درەوشاوەوە.

(فیلیپ مكگرا)

## (هیچ جیاوازییەك دروست نابێت)

رێگا چ ئەوەی كورت بێت یان درێژ، بە پێداڕۆیشتن نەبێت كۆتایی نایەت.

(فیلیپ مكگرا)

کانوونی یەکەم



٢

# مەزنەکانی مێژوو

محەمەد عەلی کلای، کارل یۆنگ، شارل دوگۆل، ئەبراهام لینکۆلن، تیۆدۆر رۆزفێلت، چارلز داروین، تۆماس جیفەرسۆن، مارتین لوتەر کینگ، ڤیکتۆر هوگۆ، جۆرج بێرناردشۆ، جۆزێف بیسمارک، ئەلبێرت کامۆ، ئەرنست هەمەنگوای، ئەلفرێد هیچکۆک، مهاتما گاندی، سوکرات، ئەفلاتون، داڤێنشی، کافکا، ڤان کوخ، مۆریس میتەرلینک، جان جاك رۆسۆ، زردەشت، لاوتزو، ئەلفرێد ئەدلەر، سەینت فرەنسیس ئاسیسی، مارکس، ئادەم سمیس، ویل رۆجەرز.

## (خاكیبوون)

كاتێك كەمێك گەورەیت (خاكیبوون) گەورەترین كێشەی جیهانە.

(محەمەد عەلی كلای)

## (گەمژە كێیە؟)

زۆربەی كات تاكەكان، ئەوانەیتر كە ناتووانن لێیان تێبگەن بە گەمژە لەقەڵەم دەدەن.

(كارل یونگ)

## (شایستەیی)

میللەتەكان هەمان ئەو مێژووە بەدەست دێنن كە شایستەیانە.

(شارل دو گۆل ١٩٧٠–١٩٨٠ فەرەنسە)

## (ستراتیژیی مشتومڕ)

كاتێك ئامادەی مشتومڕ ئەبم لەگەڵ كەسێكدا، یەك لەسەر سێی كاتەكەم بە بیركردنەوە لە خۆم و ئەو شتەی كە دەمەوێ بیڵێم تەرخان دەكەم و دوو لەسەر سێشی بۆ ئەو و ئەو شتەی كە دەیەوێ بیڵێت تەرخان دەكەم.

## (حەتمەن دەتووانم)

هەرکاتێك لە تۆیان پرسی: (ئایا دەتووانیت کارێك بکەیت، بڵێ: (بێگومان دەتووانم!) پاشان سەرقاڵ بە و بزانە چۆن دەتوانیت ئەو کارە ئەنجام بدەیت.

(تیۆدۆر رۆزفێلت)

## (رازی مانەوە)

ئەوە بەهێزترین جۆری ئێمە نییە کە زیندوو دەمێنێتەوە، هۆشمەندترینیش نییە. کەسێك بە زیندوویی دەمێنێتەوە کە لە هەمووان زیاتر لێهاتوویی گونجانی هەیە لەگەڵ گۆڕاندا.

(چارلز داروین ۱۸۰۹–۱۸۸۲)

## (بوون بە ماڵی ئەوانیتر)

هەرکاتێك پیاوێك دەچێتە بواری خزمەتکردنی خەڵکەوە دەبێ خۆی بە سامانی خەڵك هەژمار بکات.

(تۆماس جیفەرسۆن (۱۷٤۳–۱۸۲٦)

## (خۆتان بەڕێوە ببەن ئەگینا....)

ئەوانەی کە ناتووانن خۆیان بەڕێوە ببەن ناچارن ملکەچی ئەوانیتر بن.

(ڤیکتۆر هوگۆ)

## (ویژدانی كار)

ئەگەر كەسێك بە كەناس ناو ببرێت ئەوا دەبێ شەقامەكان وەها پاك بكاتەوە بەو شێوەیەی كە مایكڵ ئەنجێلۆ وێنەی دەكێشا و بتهۆڤن مۆسیقای دادەڕشت و یان شەكسپیر شیعری دەوت.

دەبێ ئەو وەها باش شەقامەكان پاك بكاتەوە كە هەموو خەڵك، ئاسمانەكان و زەوییەكان بوەستن و بڵێن لێرە كەناسێكی گەورە دەژیا كە كارەكەی بەباشی ئەنجام دەدا.

**(مارتین لوتەر كینگ**

**قەشەی رەشپێستی ئەمریكی و رابەری مافە**

**كۆمەڵایەتییەكان،براوەی خەڵاتی نۆبڵ**

**١٩٢٩-١٩٦٨**

## (خاڵی دەستپێكی ریفۆرم)

باشترین ریفۆرمكارەكانی دنیا ئەو كەسانەن كە لە خۆیانەوە دەست پێدەكەن.

**(جۆرج بێرنارد شۆ)**

## (تاكانە یان بێگانە)

بێگانەیی لەو شوێنەوە دەست پێدەكات كە تاكانەیی كۆتایی دێت.

**(جۆزێف بیسمارك)**

## (هاوینی تێکنەشکاو)

لە دڵی زستاندا، سەرەنجام من فێر بووم کە هاوینێکی تێکنەشکاو لە ناوەوەمدا شاراوەتەوە.

(ئەلبێر کامۆ)

## (پێوەری مەزنایەتی)

بەرزایی تاوەر بە سێبەرەکەی دەپێورێت و مەزنایەتی پیاویش بە ژمارەی حەسودەکانی.

(ئەرنست هەمەنگوای)

## (بردنەوە یان مردن، ئەمەیە پرسیارەکە)

لە ژیانی پاڵەوانێکدا، (لەوانەیە) و (دەشێ) بوونی نییە. پرسیارە بنچینەییەکە تەنیا (بردنەوە) یان (مردن)ە.

(ئەلفرێد هیچکۆک)

## (ڕێگەچارە)

جیاوازیی نێوان ئەو کارەی دەیکەین و ئەو کارەی دەتوانین ئەنجامی بدەین بەسە بۆئەوەی زۆربەی پرسەکانی جیهان چارەسەر بکەین.

(مەهاتما گاندی)

## (سەرەتا خۆمان)

بۆ تەکاندانی دنیا پێویستە سەرەتا خۆمان تەکان بدەین.

(سوکرات)

## (هێزی ئیمان)

(ئەگەر بە ئیمانەوە بجەنگین ئەوا دوو جار چەکدارین).

(ئەفلاتون)

## (جوڵە)

ئاسن کە سوودی لێوەرنەگیردرێت ئەوا ژەنگ دێنێت. ئاوی وەستا و پیس دەبێت. نەبوونی جوڵەش چالاکی لە ئەقڵ دەسێنێت.

(لیۆناردۆ داڤینشی)

## (ڕێگای بەرگرتن لە پیری)

هەر کەسێك توانای بینینی جوانی لە خۆیدا بپارێزێت، هیچ کاتێك پیر نابێت.

(کافکا)

## (خەت بە گومانەکانتدا بێنە)

(گەنجۆ، هەر کاتێك گوێت لێبوو دەنگێك لە ناوەوەتدا دەڵێت تۆ وێنەکێش نیت، بەوپەڕی هێزی خۆتەوە وێنە بکێشە، ئەو دەنگە کپ دەبێت، بەڵام تەنیا بە ئیش کردن).

(ڤینسنت ڤان گۆخ)

## (کڵاوی خۆشبەختی)

زۆرێك لە خەڵكی بەدوای خۆشبەختیدا دەگەڕێن وەكو چۆن كەسێك كڵاوی لەسەر بێت و بەدوایدا بگەڕێت.

**(مۆریس میتەرلینك)**

## (چۆنبوون)

بەو شێوەیەی دەتەوێ ئەوانیتر بتبینن ئاواش ئەوانیتر ببینە.

**(جان جاك رۆسۆ)**

## (خۆر بە)

خۆر بە، كە ئەگەر ویستت تیشكت نەگاتە كەسێك، نەتوانی.

**(زەردەشت)**

## (ڕیبەرایەتی)

ڕێبەری باش كەسێكە كە كاتێك كارەكەی تەواو بوو خەڵكی بڵێن ئێمە خۆمان ئەم كارە دەكەین.

**(لاوتزو)**

## (جەنگ و ژیان)

جەنگ لە پێناو پرەنسیپەكانی خۆتدا ئاسانترە لە ژیان لەگەڵیاندا.

**(ئەلفرێد ئادلەر)**

## (باشترین ئامۆژگاری)

لە هیچ شوێنێك دەستكردن بە ئامۆژگ ری كاریگەر نییە مەگەر ئەوەی كە ئامۆژگارییەكانمان كردارەكانمان بن.

**(سەینت فرەنسیس ئاسیسی)**

## (پێوەرێكی بەرەوپێشچوون)

دەكرێ بەرەوپێشچوونی كۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای شوێنی ژن لە كۆمەڵدا پێوانە بكرێت.

**(ماركس)**

## (هەژاریی ئاواتەكان)

تراژیدیای راستەقینەی هەژارەكان، هەژاربوونی ئاوات و ئیلهامەكانیانە.

**(ئادەم سمیس)**